لەوتارەکانی مامۆستا شێرزاد



# زاڵبوون بەسەر
# نەفس و شەیتان

ن/ ئیلاف احمد غەزالی



یەکەم چاپ
٢٠١٠
هەولێر



## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتوك : زاڵبوون بەسەر نەفس و شەیتان ( لە وتارەکانی مامۆستا شێرزاد )

بابەت : ئایین

لە نوسینەوەی- ئیلاف احمد غەزالی

کۆمپیوتەر: نووسینگەی هیوا

چاپی : یەکەم / ٢٠١٠

شوێنی بڵاوکردنەوە: (( کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی ))

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٤٤١)ی ساڵی(٢٠١٠)ی پێدراوە.

بڵاوکراوەی کتێبخانەی

حاجی قادری کۆیی

بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە

هەولێر کوردستان عیراق

(٠٧٥٠ ٤٦٧ ١٣ ٩٤ / - ٠٧٥٠ ١١٨ ١٩ ١٩ . ☎- ٠٦٦ ٢٢ ٢٣ ٨٦٨,

# زاڵبوون بەسەر نەفس و شەیتان

## لە وتارەکانی- مامۆستا شێرزاد

نوسینەوەی

ئیلاف احمد غەزاڵی

چاپی یەکەم

٢٠١٠

هەولێر

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی:

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على نبينا محمد المبعوث رحمة للعالمين وعلى آله وأصحابه ومن تمسك بسنته وسار على نهجه الى يوم الدين اما بعد.

خوێنەری بەڕێز: زۆر بە پێویستم زانی کەوا لە ڕۆژگارێکی ئاوا پڕ لە تاوانو بێ ئاگا لەدوارِۆژو سەرقاڵ بە دونیا، بابەتێکی هەستیار کە موسڵمانان ئاگادار دەکاتەوە لەو دوژمنەی بەردەوام لە لەبۆسەدایە بۆ مرۆڤ، لەو هەواو ئارەزووانەی بەردەوام پاڵ بە موسڵمانان دەنێت بۆ کاری نارەوا. دەقی چەند وتارێکی مامۆستای بەڕێز(م / شێرزاد عبدالوهاب) لەسەر کاسێت بخەمە سەر کاغەز بۆ زیاتر سوود وەرگرتن. ئەم بەرهەمە وەك دیارییەك پێشکەشی ئێوەی ئازیز بکەم، بەو هیوایەی ببێتە ڕەزامەندی خوای بالادەستو بیکا بە زەخیرەیەك بۆ بەندەو سوودو قازانجی دونیاو دوا ڕۆژ بۆ هەموولایەك..

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

**ئیلاف احمد غەزالی**

٢٠-١١-٢٠٠٨-ز



بسم الله الرحمن الرحیم

## پێشەکی:

پــێ خۆشــحاڵم کــەوا جــارێکی دیکــەش. بــەنێوەی خۆشەویــست گەیشتمەوە، خوای گەورە هەموو لایەك پایــەدار بکــات، خــوا تەمــەنتان درێژبکا، خوای گەورە یارمەتی هەموو لایەك بدات بۆنەوەی بتوانین ئــەو خوایە"العظیم"ە ئەو خوایە میهرەبانە، ئــەو خوایــە بــەرەحمو بەبەزەییــە لەخۆمان ڕازی بکەین، تاعەتو بەندایەتییەکی چاکی بۆ بکەین، إنـشاء الله لە ڕۆژی قیامەتیش دا دەفتەرەکان بەدەستی ڕاســت وەربگرینــەوە بــە ئیزنی خودا ..ئازیزانم: ئەو محاضرەیە پێم خۆشە ئەگەر خوای گەورە تەمەن باقی بکا چەند سیفاتێك باس بکەین انشاء الله، سیفەتی ئەو کەسانەی کە بەڕاستی بەسەر نەفسی خۆیاندا زاڵن.

چونکە هــەموو مانــدووبوونی کــابرای ڕێبــوار بــەرەو "رب العــالمین"ە کابرای ڕێبوار دەیەوێ خۆی تەزکیە بکاتو نــەفسو دڵو دەروونــی خــۆی پاکبکاتەوە لەگەڵ خــوای گــەورە یــەکلا ببێتــەوە، ئــەوا بەڕاســتی چــەند سیفاتێك هەیە دەبێ ئــەو ســیفاتانەی لێ بێتــەجێ، چــەند تایبەتمەنــدیو سیفاتێك هەیە دەبێ لێ بێتە جێ، چــونکە ئــازیزانم: لــەو ڕۆژەی خــوای گەورە ئادەمی لە بەهەشت لەگــەڵ حــەواءی دایکمــان"صــلاةو ســلامی

خوایان لێبیێ" دەرکرانو بەرەو زەوی هاتن، سێ یەم کەس کە لەگەڵ وان فرێدرایە سەر زەوی شەیتان بوو.! تا لەو زەویەدا شەڕەکە دەستی پێکرد لە بەینی ئینسانو لە بەینی شەیتانەکان خوای گەورە دەفەرمووێ: ((**قَالَ اهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى**)) طه: ١٢٣ پێمان فەرموون: هەمووتان برۆنە خوارەوە، هەمووتان لە بەهەشت دابەزن لە ئاسمان دابەزن جا ئادەمو حەواو شەیتان " فإما یأتینکم منی هدی" لەمەودوا هوداو ڕێ پیشاندەرو بەرنامەو یاساو دەستور لەلایان خواوە بۆ ئەو کەسانە دێ کە لەسەر زەوین " فمن اتبع هداي" ئەو کەسەی بەدوای هیدایەت بکەوێ بەدوای ڕێنمایەکانی خوای گەورە بکەوێ "فلا یضلوا ولا یشقی" نە ڕێ ی لێ بزر دەبیو نەبە هیلاکیش دەچی، جا بەڕاستی کەسێك بەدوای خوای گەورە بکەوێ بەدوای پێغەمبەر(ﷺ) بکەوێ نە ڕێی لێ بزر دەبێ و نە بەهیلاکیش دەچێت، جا ئەلێرە ئەو شەڕەی کەدەکرێ لەسەر زەوی لەبەینی ئینسانو لەبەینی شەیتان بەموشەكو بە شیرو بەتیرو تفەنگو خەنجەر نیە! بە شێوەیەکی دیکەیە، ئەسڵەن شەڕەکە نادیارە بەڵام ئاساری دۆڕاندنو بردنەوەی شەڕی تێدا دەبینی.

ئاساری دۆڕاندنەکەی ئەوەیە دەبینی، ئەم کەسە گومڕابووە بەدوای نەفسو هەوای خۆی کەوتووە گوناه دەکا، هەموو شتێك کە خوا پێی ناخۆشە دەیکا، نیشانەی ئەوەیە ئەوا دۆڕاندیتی بەرامبەر شەیتانی،

نیشانەی بردنەوەش ئەوەیە ئەو مرۆڤە ئەم موسڵمانە ئەم خوشکە ئەم کوڕە دەبینی شەو نوێژ دەکا، خۆی دەپارێزی لە گوناه، واجباتەکان زۆر بەجوانی زۆر بەرێكوپێکی جێ بەجێ دەکات.

هەروەها دوورە لەهەموو ئەو شتانەی خواو پێغەمبەری خوا پێیان ناخۆشە، دوورە لەهەموو شوێنێك کە خواو پێغەمبەر پێیان ناخۆشە، ئەوەش دەلیلی ئەوەیە کە ئەوە لە شەڕەکەی بردیتیەوە، بەڕاستی ئەو شەڕە شەڕێکی هەتا بڵێی خوێناویە بەبێ ئەوەی یەك پشکە خوێنیشی لێ بڕژێ، هەتا بڵێی ناخۆشە بەبێ ئەوەی هیچ ئاساری تۆزو تەقەشی لێوە دیاربێ. بەڵام ئەوەی بەشداری دەکا لە شەڕەکە قەڵبە، شوێنی شەڕەکە ناو دڵی ئینسانەکانە، ئەوەی یارمەتی شەیتان دەدا لەو شەڕەدا نەفس و هەوایە، ئەوەی کە یارمەتی خودی ئینسانەکە دەدا مەلائیکەت و عەقڵیەتی، تەماشا بکەن، ئەو قەلبە دوو جەبهەی لێ دروست بووە جەبهەیەك شەیتان و نەفس و هەوا پێکەوە جەبهەکیان گرتیە، لەو لایەشەوە جەبهەکەیدی خودای "رب العزة" لەگەڵ مەلائیکەتەکان و لەگەڵ عەقڵی ئینسانەکە، لەنێوان ئەم دوو جەبهەیە شەڕەکە بەردەوام دەبێتن، جا ئەم شەڕە وەنییە بەڕۆژەك و دوو ڕۆژ کۆتایی پێبێ، وەنییە بە ساڵێك و دوو ساڵ کۆتایی پێبێ، شەڕی عیراق و ئێران هەشت ساڵی خەیاند دوایی هەر کۆتایی پێ هات.

بەڵام ئەم شەڕە هەتا مردنە، هەتا ئەو ڕۆژەی کە ئەو ئینسانە لەناو

قەبری دەنێن، ئینجا شەیتان وازی لێدێنی، سبحان اللە.. لە یەکەم چرکەی کە ئەو منداڵە لەدایکی دەبێ شەیتان دەیەوێ زەفەری پێ ببا، هەتا ئەو کاتەی ڕووحی دەکێشن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەیەك لە فەرموودەکان دەفەرمووێ: هەر منداڵێك ببێ ئیلا شەیتان قونجیلکەیەکی لێداوە، ئیلا حەزرەتی عیسا نەبێ (سەلامی خوای لێ بێ) لەسەر هەموو پێغەمبەران بێ، ئیلا ئەو نەبێ شەیتان نەیتوانیوە زەفەری پێببا، ئەگەرنا ئیلا شەیتانی مەلعون ویستوویەتی زەفەر بەهەموو ئینسانەکان ببا، دەی کەواتە تۆ لەناو لانکی تازە بووی، هیچ عەقڵو شعورت نییە، نە دەزانی شەڕ چیە.! نە دەزانی شەیتان چیە.! هیچ نازانی ئینجا شەیتانەکە دەیەوێ زوو زوو تۆ چاو ترسا بکاو زوو زەفەرت پێ ببا، جا بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: (ﷺ) نابینی منداڵ کەوا لەناکاو لە قیژەی گریانێ دەدا، بەبێ ئەوەی ئەبرسی بی نە نەخۆشیش بت، جا ئاخیرو دوا قۆناغی کە مردنە ئەو وەختی وا کۆمەڵە مەلائیکەتێك دەورەیان لێدایە دەیانەوێ ڕووحەکەی لێ وەربگرنەوە، ئا لەو وەختی شەیتان دەیەوێ تۆ بەکافری بمری..

دەیەوێ ئا لەو کاتەوە بەئیمانەوە، ئەم دونیایە بەجێ نێڵیو ڕەوانەی جەهەننەمت بکات. جا ئازیزانم ئەم شەڕە خۆ ئامادەکردنی دەوێ، ئەو هەموو عیلمەی ئێستا دەیخوێنین، ئەو هەموو وانەیەی، دامان، هەمووی بۆ ئەوەیە جانیبی خێرەکە مەلائیکەتو عەقلەکەی ئینسانی پێ بەهێز

بێ، چونکە یەك لەو هۆکارانەی، موسڵمان لەو شەڕەدا نەبەزێ ئەوەیە دەبێ گوێ لە ئامۆژگاری بگرێ، گوێ لە مامۆستایان بگری، بۆ ئەوەی ئیمانی پێ پتەو بی، بۆ ئەوەی لایەنی خێر لەو ئینسانەدا بەقووەت بێ، بە ئومێدی ئەوەی ئەو شەڕە بەسەرکەوتوویی بباتەوە، چونکە لەو شەڕەدا بدۆڕێنی هەتا هەتایە دۆڕاوی، بەڵام ئەگەر لەو شەڕەدا ببەیتەوە، هەتا هەتایێ لۆ خۆت سەرکەوتووی، لەبەرئەوەی ئەنجامی شەڕەکە یان بەهەشتە یان جەهەننەمە، دۆڕاوەکان ئەچن بۆ جەهەننەم براوەکانیش ئەچنە بەهەشت.

دۆڕاوەکان لەگەڵ خراپترین خەڵقی خوانە لەگەڵ وان دەیانهاوێنە جەهەننەمێ، براوەکانیش لەگەڵ چاکەکانی خەڵقی خوان، لەگەڵ پێغەمبەرانو ساڵیحانو شەهیدانو وەلیەکان لەگەڵ ئەوان لەوێندەر خڕدەکرێنەوە، ئینسان دەبێ هەڵبژێری لە ئێستاوە ڕا کامە فەریقت دەوێ، کامە شوێنت دەوێ بۆ خۆت، ئایا حەزدەکەی لەگەڵ براوەکان بی، یان لەگەڵ دۆڕاوەکان بی، جا ئەم شەڕە بەڕاستی خۆ ئامادەکردنی دەوێ، عیلمو مەعریفەتو سەقافەتی دەوێ، دەبێ بزانی ئایا شەیتانو نەفسو هەوا چۆن لۆت دێنە پێش؟ بە چ شێوەیەك بۆت دێنە پێش؟ خاڵی لاوازی تۆ لە کوێندەرە؟!

"سبحان الله" تێبینیەك بفەرموون: ئازیزانم: چ شەهادەیەك لە پاش پرۆفیسۆری هەیە، پاش دکتۆرا پێی دەڵێن پرۆفیسۆر وانییە؟! پاش

پرۆفیسۆر هیچ شەهادەیەك نییە، بەس شەیتان هەیتی، هیچ شـەهادەیەك نییە ناوی لیبنێیت کاکە ئەوە ئەلّفو دالّ هەیە، بڕوا بکـە ئـەو شـەیتانە موناقەشەی دکتۆرای دکتۆرایەکانیش دەکـا، هەنـدە زیرەکـە.. جـا ئـەو شەیتانە بزانە لە عیلمی نەفس لـە هـەموو خـەڵکان زیـرەك تـرە.. ئـەو ئینسانەی جوان جوان شیتەڵ کردیە، لە تۆقی سەری هەتا بنی پێی شیتەڵ کردووە، دەزانی نوقتەی لاوازی ئەو ئینسانە لە کوێندەرە. بـەڵام ئافـەرین دەبێ ئەو موسڵمانەش بزانی نوقتەی لاوازی شـەیتان لـە کوێیــە. ئەوەیـە فێڵ لە فێڵی دەکرێتن، خۆ هەر ئەوە نییە ئەتو فێڵ زانی بی، ئـەخێر ئـەو کەسە عاقلە کە فێڵ لە فێڵی بکا، ئەو کەسـە زیـرەكو بلیمەتـە بتـوانی نوقتەی لاوازی شەیتانی بباتەوە، نوقتەی زوحفی شەیتانی چیە؟! بانگە..! هەر بانگ دەدرێ شەیتان هەڵدێ، پێغەمبەر "سەلامی خوای لەسەر بـێ" دەفەرمووێت" هەر بانگ درا "لاحیاء في طلب الدین" شـەیتان لـە خـۆ هەڵدەداو ئەو شوێنە بەجێ دێڵی ..

نوقتەی زوحفی شەیتانی ئەوەیە تۆ ببینی لەسـەر دووگـوردی، ئـەتوو ببینی قورئانی دەخوێنی، نوقتەی زوحفی شەیتانی ئەوەیە ئـەتوو ببینـی ئامۆژگاری خەڵکی دەکەی، نوقتەی زوحفی شەیتانی ئەوەیە ئەتوو ببینـی دەستی برایـەکت گرتیـە دەسـتی خوشـکێکت گرتـووە یارمـەتی دەدەی، بەئەوانە هەمووی پشتی دەشکێ. پێی ناخۆشـە، هـەتا پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرمووێ: ئەو کاتەی شەیتان کە موسڵمانەك سوژدەیەك بۆ خـوا دەبـا،

شەیتان ئاخ‌و حەسرەت هەڵدەکێشی دەڵێ: ئاه قوڕم بەسەری ئەمن سوژدەم نەبرد نەعلەتیان لێ کردم. بزانە ئەوە سوژدەی بۆ خوا دەبا، چۆن لێ دەگەڕێم سوژدەی بباتن، جا بەڕاستی هەرچی شەیتان پێی ناخۆشە ئەوە نوقتەی زوحفی شەیتانییە ..

ئینسان دەبێ زۆر زۆر وریاو حکیم‌و عاقڵ بێ، لۆ ئەو مەسائیلانەش کتێبێك هەیە ناوی "ضحایا الشیطان" کتێبێکی زۆر زۆر خۆشە، پێم خۆشە بیخوێننەوە، ناوی ئەو کتێبانەتان پێ دەڵێم بکڕن، فورسەتە بۆ خۆتان بە خوای باشترە پاشان بۆتان دەبێتە زەخیرەیەکی زۆر باش لەناو مەکتەبەکەتان، ئایا سیفەتی ئەو موسڵمانانە چین کەلەو شەڕە دەبەنەوە لۆوەی بزانین ئێمە لەوانین یان لەوان نین، ئایا چەندە سیفاتی ئەو کەسانەمان تێدایە کە بەڕاستی لەم شەڕە خوێناوی‌و بێ خوێنەیە.! لەم شەڕە گەرم‌و بێ تەقەیە..!

ئایا سیفاتی ئەو کەسانەمان تێدایە کەلەم شەڕەدا سەردەکەون یا نا..

سیفەتی یەکەم: لەو کەسانەدا هەیە، لەم شەڕە خوێناویە ئەیبەنەوە،تەجریدە.. تەجرید بەسێ جۆریەوە، یەکەمین ئەو کابرایەی یەکلا بوویتەوە، تەجرید یەعنی یەك لابوونەوە، یەعنی خاوێن بوونەوە، خۆ یەکلاکردنەوە، لە تەوحید یەکلابوویتەوە. غەیری ئەو خودایەی نەبی کەس ناپەرستێ، غەیری ئەو خودایەی نەبێ لە کەس داوا ناکاتن، لەغەیری ئەو خودایەی نەبێ سەر نابڕێ، قوربانی ناکا تەنیا بۆ خوا نەبێ

، هاواری ئەم خودایە نەبێ هاواری کەسی تر ناکا، هەتا ئەگەر نەزر بکا، هەر بۆ خوایە، نە نەزەریّ بۆ عەمرو زەید دەکا، نە سوێندیش بەسەری باب‌و باپیرت دەخوا، بەڵکو حەتا ئەگەر سوێندیشی بخوا سوێند بە خوا دەخوا، ئەوە تەجریدە لە تەوحید، کە دەبێ یەکلاببێتەوە لەگەڵ خوای گەورە، جا ساحێبی ئەم سیفەتە جوانە بۆیە دەبینی هەرگیز بڕوای بە دارو بەرد نییە، بۆ نموونە، دارێك هەیە، دەڵێن تۆ بزمارەکی لێدە مرازت حاسڵ دەبێ، خوشکانی بەڕێزم: زۆر جاران بەلای گوندی دارە بزمارەدا چوویمە، دارەکەیان دایتە بەر بزماران وەڵلاهی زمانی هەبێ هاوار دەکا.

دەڵێ: لەڕاهی ئەو خوایەی وەرن بمبڕنەوە، وەڵلاهـ فەوتام لەبن دەستی ژنان، هەرچی دەچی گرم گرم دووسێ بزماری لێ دەدا، چیە..؟! مرازم حاسڵ بێ، توخوا ئەوە کو مرازی حاسڵ دەکا ، ئەو دارە وا بەخۆی هاوار دەکا بەستەزمانەی هەمووی کون کون بووە، جا بەڕاستی ئەو کەسەی لە تەوحیددا تەجرید نەبێ‌و یەکلانەبێتەوە زۆر زۆر ترسناکە، پێویستە بزانی هەموو چاکەیەك‌و قازانجێك ئیلا بەدەست " اللە"یە هەموو چاکەو قازانجێك هەموو بە دەست خوایە، هەموو نەفع‌و زەرێك هەموو بەدەست "رب العالمین"ە بەدەست کەس نییە.." واعلم إن ما أصابك لم یكن لیخطئك وما أخطاك لم یكن لیصبك" پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێ بزانە ئەوەی کە تووشت هاتووە ئەوە هەر ئی تووە ئی کەسی تر نییە، ئەوەی کە تووشت نەهاتووە هەر ئی توونییە بۆیە تووشت نەهاتووە، زۆر جاران

شتەك ڕوونەدا دەڵێ "الحمد الله" كورە چانەبوو خۆم قورتاركرد، كورە بەخوای خوا قوتاری كردی، جا هەندە عاقڵی خۆت پێ قوتار بكرێ، تەماشا دەبینی لە شتێك دەباتەوە قازانجێكی زۆر دەكا، دەڵێ: دیتت ئەو عەقڵە پیتۆڵەم پێوەیە، ئەوهاو ئەوهام كرد، ئەوەندەم قازانج كرد، نالێ ئەوە لوتفی خوایە كەرەمی خوایە ئەوەی بە لای تۆ دانەهاتییە بۆ تۆ نەبووە وەڵلاهی لە زیرەكی خۆت نییە.

ڕاستە ئینسان بە قەدەری یەكی دووبەش عەقڵ‌و ئیرادەو شتی پێوەیە، بەڵام هەمووی ئی خوایە لە ئەساس دا،"قل كل من عنداللـه" بەڵكو هەمووی لە تەرەف خوای "رب العالمين"ە جا بەڕاستی ئەو كەسە لە غەیری خوای گەورە نەبێ ناترسێ، لۆیێ دەبینی ئەوەی كە دەترسێ بەڕاستی لە زوحفی ئیمانە، ئینسان نابی بترسێ، چونكە پێغەمبەر-صلى الله عليه وسلم- ئامۆژگاری ئیبین عباس دەكا، دەفەرمووێ: ڕۆڵە گیان یا غولام "بزانە حەدیسەكەیا، كە دەفەرمووێ: "إحفظ الله يحفظك" أحفظ الله تجده تجاهك إذا سألت فسأل الله، وإذا استعنت فاستعن بالله واعلم أن الامة لو اجتمعوا عليك على أن ينفعك بشيءٍ لا ينفعوك إلا بشيءٍ الاما كتبه الله لك واعلم أن الامة لو اجتمعوا عليك على إن يضروك بشيء لا يضروك بشيءٍ إلا ما كتب الله لك"

ئەو فەرموودە زۆر "عظیم"ە زۆر زۆر جوان لەبەری كەن، وەڵلاهی ئەو فەرموودەیە ئی گەنجانە چونكە پێغەمبەری خوا بۆ گەنجانی فەرموو:،

دەبێ بەڕاستی گەنجەکان ئەو فەرموودەیە لەبەرکەن، زۆر زۆر جوان لێی حاڵی بن، ئینجا ئەتوانن عەقیدەیەکی پوختو جوانیان هەبێ، تەماشا چ دەفەرمووێ: بزانە ڕۆڵەگیان ئەگەر هەموو ئوممەت خڕببتەوە،" علی ان ینفعوك بشيءِ" بۆوەی یەك ئیستفادەت پێ بگەینن ناتوانن..! ئیلا ئەگەر خوا لۆتووی نووسیبی، وەڵڵاهی هەموو عالەم لە دووت بی زیانت پێ بگەینی ناتوانی، هەموو عالەم لە دووت بن زیانێکت لێیدەن ناتوانن، هەموو عالەمیشت لە دووبی قازانجەکت پێ بگەیێنن ناتوانن، لەکۆتایی دەفەرمووێتن: رفعت أقلام وجفت الصحف" تازە خلاس ئەوەی نوسرابێت نوسرایە لە لوح المحفوظ" قەڵەمەکە بلند کرا" رفعت ألاقلام" " وجفت الصحف" ئەوەی کە نوسراشە حیبرەکە ووشك بووە، ئەزیاد دەکرێ ئەکەم دەکرێ، دەی کەواتە ئینسان دەبێ لەو شتەدا لەناو عەقیدەدا یەکلا ببێتەوە لەگەڵ خوای خۆی، لەکەس ئەترسێت، هەر لەو داوا بکات، هەر لەو بترسێت، پشتو پەناشی هەر خودای "رب العالمین" بێت، ئەوە بەکورتیو بەکوردی تەجریدی لە تەوحید.. تەجریدی مەبەست، واتە خۆی یەکلا کردیتەوە لەوەی هەموو شتەك تەنیا بۆخوا ئەیکا، هەموو شتێکی تەنهاو تەنها بۆ خوای "رب العالمین"ە، پێش ئەوەی شتێك ئەنجام بدات سەرەتا تەماشای نییەتی خۆی دەکات، ئایا بۆ خوایە یان بۆ خوا نییە..؟

بۆیە دەفەرمووێ:"المؤمنين وقافاً" یەعنی ئینسانی ئیماندار وەقافە. یەعنی پێش هەموو شتێ، هەر شتێك بکا ڕائەوەستێ.. فکرێك لە حالی

خۆی نەکاتەوە، ئایا ئەو شتەم بۆ خوایە یان بۆخوا نییە، ئەگەر بۆ خوا بوو ئەنجامی ئەدا، ئەگەر بۆ خوای نییە نییەتەکەی خۆی ئەگۆڕی، دەبێ بۆ خوای بێ ئینجا ئەنجامی ئەدا.. جا بە ڕاستی بۆیە خوای گەورە هەربە خۆی لەو ئایەتدا کە دەفەرموویت: ﴿ قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾

بەڕاستی دەبێ نوێژت زیکرت تەهلیلەت عیبادەتت ژیانت مردنت، هەمووی لە بۆ خودای"رب العالمين" بێت، لە تەجریدی قەسد ئەوەیە کە تۆ هەر ئیشێك کە دەیکەی ، دەبێ، ئیلا ئەو ئیشەلە بۆ خوای بی، چەند جاری دیکەشم گێڕایتەوە، دەڵێن: جارەکی بەکابرایەکیان گوت: وەرە بابچینە سەر قەبران، ئەوە ئەو پیاوەی مردووە با بچین، لەگەڵ مەیتەکەی بڕۆین بینێژین..کابراش گوتی.. ئێ باشە یەك دەقە دەچمە ژووریّو دێمەوە، چووە ژووریّو هاتە دەرێ لە گەڵ ئەوان ڕۆیی، دیتیان کابرا نە چاکەتی گۆڕیە نە پێلاوی گۆڕیە نە خۆی گۆڕیە بەس موجەڕەد چوویتە ژووریّ وهاتە دەرێ، گوتیان: باشە لۆ چوویە ژووریّ پێنج شەش دەقەشت پێ چوو.. نەپێلاوت گۆڕی نەشمەکت گۆڕی بۆ تە ئخیر بووی، فەرمووی: چووم نییەتی خۆم ساف کرد، نییەتەکەم کردە خوای گەورە، ئینجا من هاتم بە گەر ئێوە کەتم، جابۆیە لەیەك لە غەزاوەتەکان، یەك لەشەڕەکان..

دەڵێن: ئیمامی علی..کرم الله وجهه..لەگەڵ کابرایەکی لێك دەدەن، دەیەوێ کابرای بکوژی، کابرا کافرەکە تفێك لە ئیمامی علی دەکا، کە

تفەکەی لێ دەکا، لێی دەگەڕێ ونایکوژێ، گوتیان بۆ نەتکوشت؟ گوتی: ئەگەرىم کوشتبایە ئەوە ئینتیقامی تفەکەی بوو، لە بۆ خوای نەبوو! بزانە چەند بە ملاحەزەبووە، چەند جوان ویستوویەتی ئەگەر بشی کوژێ تەنها لە بۆ خوای بێ، نەك لە بۆ تۆڵە سەندنەوەی نەفسی خۆی بێ، جابەڕاستی سیفەتی تەجرید زۆر سیفەتێکی "عظیم"ە، دەبێ ئەونینسانە ئەم موسڵمانە ئەم ڕێبوارە کاروانیە دەبێ نییەتیشی هەرهەموو لە بۆ خوای بێ، ژیانی: مردنی، خواردنی، هەتا کەدەنویێن، هەتا کە دەڕواتن، دەبێ بۆ خوابێ، تەماشا پێغەمبەر..صلی اللە علیە وسلم..دەفەرمووێ:" کابرایەك سەردانی کابرایەکی دەکرد، خوای گەورە مەلائیکەتێکی نارد. لێی پرسی کابرا دەچیە کوێ..؟ گوتی: دەچمە گوندەکی، برادەرەکم لەوێیە. فەرمووی: مەعامەلاتو کڕینو فرۆشتنتان لەگەڵ یەکتر هەیە؟ گوتی: ناوەڵڵاهـ. فەرمووی: خزمتە.؟ گوتی: ناوەڵڵا..فەرمووی: ئەی بۆ ئەچی.؟ گوتی: لە ڕاهی خوای هەر خۆشم دەوێ لەڕاهی خوا سەری لێئەدەم، فەرمووی: دە موژدەت لێبێ من مەلائیکەتی خوام، خوا منی ناردووە، موژدەت پێ بدەم بزانە کە خوا ئەتووی خۆشدەوێ.

بەڕاستی نیعمەتە.. سەردانی هەر کەسێك دەکەی "للـە" "وفي اللە" بچی، جا بەڕاستی ئینسان یەك درهەمی هەبی لە ڕایی خوای بیکاتە خێر، خوا خێرەکەی بە حەوت سەد درهەم بۆی دەنوسی ، دەباشە ئەگەر ئەو درهەمەی لە بۆ خوای نەبوو، درهەمەکەش دەڕواو لەڕۆژی قیامەتێ

سزاش دەدرێت!، لەبەرئەوەی شتی لە پێناوی خوای نەکردە خێر، جا ئینسان دەبی هەموو حەرەکاتو سەکەناتی بەڕاستی لە بۆ خوای یەکلا بکاتەوە، ئینجا ئەو دڵسۆزیە بۆنی خۆش دەبی، خەڵك ئیشەکەت قبووڵ دەکەن، شتەکەت لێ قبووڵ دەکەن، شتەکەت لێ وەردەگرن، بێجگە لەوەی کە خوای گەورە لێشت قبووڵ دەکاتن، تەجریدی سێ یەم: تەجریدی موتابەعەیە، یەکەم: سیفەت گوتمان تەجریدە خۆ یەکلاکردنەوەیە، خۆ یەکلاکردنەوە لە تەوحید لە یەکتاپەرستی خوای گەورە، خۆ یەکلاکردنەوە لە نییەت، دوایی سێ یەمین: خۆ یەکلاکردنەوە لە موتابەعە، ئەوەیە ئینسانی موسڵمان هەتا هەر ئیشێك دەکا، کارێك ئەکا ئەبێ ئەو کارە سوننەتی پێغەمبەری لەسەر بێ-صلى الله عليه وسلم- ئەم کارە دەبێ پێغەمبەری خوا ئیزنی دابێ کە ئەمن ئەو ئیشە بکەم، کە دەبی شەرعی خوای گەورە ئیزنی دابێ، ئەمن ئەو ئیشە بکەم، ڕاستە نییەتەکەم بۆ خوایە، بەس شەرت نییە پێغەمبەری خوا موافەقەی لەسەر کردبی، جا زۆر شەرتە ئەو ئیشەی کە دەیکەی، ئەو کارەی کە ئەنجامی ئەدەی، دەبێ ئەم کارە بۆ خوا بێ و سوننەتو شەرع ڕێیان پێ دابێ، چونکە هەر ئیشەك بەڕاستی ئەگەر شەرعی خوا ڕێ ی پێ نەدابی، ئەوە لە بۆ خوا حسێب ناکرێت، با نییەتیشت خودای گەورە بێت، بۆیە، خوای گەورە هەر بۆ خۆی ئەفەرموویت:﴿ وَأَنَّ هَـذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَـاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُـواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ﴾ جا بەڕاستی ئەمە ڕێگای خودایە، دیارە..

"الصراط المستقیم" دیارە دەبێ پێیدا بڕۆیت، بۆ خۆت بەزەین و فکری خۆت ، ئەنواع ئەزکارو، ئەنواع عیبادات دروست نەکەی بڵێی ئەوانە خوای گەورە پێی خۆشە، نەخێر. هەتا جارەکی پێغەمبەر-صلی الله علیه وسلم- کابرایەکی دیت لەبەر ڕۆژێ ڕاوەستا بوو، فەرمووی: " ئەوە چ دەکا"؟ گوتیان یا رسول الله ئەوە دەڵێ: لە بۆ خوای لەبەر ڕۆژێ ڕا دەوەستم.! فەرمووی: بانگی کەنەوە ئەوە هیچ لە بۆ خوای نییە. خوا گەورە حەز بەوە ناکاتن، جا زۆر عیبادات هەیە، هەندێ مەراسیمی زیکرو تەهلیلە هەیە، ئینسان، خەڵك جێ بە جێی دەکەن، وا دەزانن بۆخوایە، بەڵام وانییە..

هەر زیکرێك کە دەیکەیت، هەر ئیشێك کە دەیکەیت، بەڕاستی دەبێ شەرع نەخشەکەشی بۆ کێشا بێ، مەسەلەن دەتەوێ نوێژی نیوەڕۆ بکەیت، وەنیە.؟ بڵێی ئەمن بۆ خوای هەشت رکەعاتی دەکەم چواریشی زیاد، دە وەڵڵاهی خوا نایەوێ، لۆ..؟ چونکە پێغەمبەر-صلی الله علیه وسلم- چواری کردووە، دەتەوێ ڕۆژوو بگری بڵێی وەڵڵا ئەمن هەتا نوێژی عیشایێ بانگ نەدا فتار ناکەمەوە، با خوا خێرم زۆر بۆ بنوسی وەڵڵاهی وەنیە.. لەبەر ئەوەی خوای گەورە هەتا مەغریبێ لێت قبوولێ دەکا، بزانە زیادکردن لە عیبادات، خوای گەورە نایەوێ، چونکە ئێمە دەبێ موتەبیع بین نەك موبتەدیع.

نابی بەخۆمان شت دروست بکەین، دەبی ئێمە بەدوای پێغەمبەری

خـوا بکـەوین-صـلی اللـه علیـه وسـلم- لـە هـەموو حـەرەکاتو سەکەناتێکمان، یەکەم: سیفاتی (ئـەهلی نەسـرەت)، ئەوانـەی بەڕاسـتی بەسەر نەفسی خۆیان دا زاڵ بوونە، ئەوەیە کە ئەوانە یەکلابووینەوە، هـەم لە تەوحید هەم لە نییەت هەم لە موتابەعەدا، سیفەتی دووەمیان: ئەوانـە بەڕاستی شەعائیری خوا زۆر تەعزیم دەکەن، خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿ ذَلِـكَ وَمَـن يُعَظِّـمْ شَـعَائِرَ اللَّـهِ فَإِنَّهَـا مِـن تَقْـوَى الْقُلُـوبِ ﴾ الحج: (32) دەفەرمووێ: ئاوایە کەسێك کەوا تعظیمی شەعائیری خوای گەورە بکـات، بە گەورەی بزانی.. بە قەدری بزانی.. بەڕاستی نیشانەی ئەوەیە کەوا ئـەو دڵەی بە ئاگایەو تـەقوا داریـشە، جـا بەڕاسـتی ئـازیزانم: لـە چ دەبیـنن تەعزیمی شەعائیری خوای گەورە، لە بـانگ.. کـە بـانگ دەدرێ، ئەگـەر لەگەڵ بانگ کابرا گوتی الله أكبر- الله أكبر-أشهد أن لا إله الا الله-أشهد أن محمد رسـول الله" جوابی بانگەکەی داوە بزانە ئەوە تەعزیمی شـەعائیری خوای دەکا، چونکە بانگ یەکێکە لە شەعائیرەکانی ئیسلام. ئەگەر بێتوو قورئان خوێندرا دەبینی زۆر بە ویقارەوە گوێ لە قورئانەکە ڕادەگـری، زۆر جاران دەبینی لەپرسەدا قورئان دەخوێندرێ قسەش دەکرێ،

دە وەڵڵاهی بزانە ئەو دڵانە مردوون، بزانە هەتا ئەگـەر مـەلاش بـێ، بزانە دڵی مردووە ئاگای لە هیچ نییە، بە کەیفی خۆی قسان دەکـا، جـا بەڕاستی ئینسان هەندێ شەعائیری خوا هەن، مزگەوت یەك لە شەعائیری ئیسلامە، دەبی قەدری مزگەوت بگری، پێغەمبەر-صلی الە علیە وسلم-

دەفەرمووێ: هەر کەسێك تفێك لە مزگەوت ڕوو بکا. گوناهێکەو کەفارەتەکەشی ئەوەیە دەبی بچێ لای ببەیتو بیسڕیتەوە، جا ئازیزانم: ڕێزگرتنو قەدر گرتنی شەعائیرەکانی خودا، شەعائیرەکانی ئیسلام، بەتایبەتی سوننەتەکانی پێغەمبەر-صلی الله علیه وسلم- بەڕاستی نیشانەی زیندووی دڵی ئەم ئینسانەیە، نیشانەی بردنەوەو ئەسرەتی ئەو ئینسانەیە، جا زۆر زۆر ئاگاتان لە خۆتان بێت لە کاتێك هەر حاڵەتێکی ئاوا هاتە پێشتان، زۆر وریا بن.

زۆر بە مەوقیفێکی سەلیم، بە هەڵوێستێکی مەردانە کە نیشانەی ئەسرەتی ئەم دینەیە، بجولێینەوە لەگەڵ ئەوەی، هەتا لەکاتی نوێژەکان، بزانن نوێژ گەورەترین شەعیرەی ئیسلامە، دەبی ئەم نوێژە زۆر بە جوانی بکرێ، زۆر بە ڕێكو پێکی بکرێ، زۆر بە ویقار بکرێ، پاشانیش نەك هەر ئەوە، دەبی ئەم نوێژە سوونەتەکانیشی لەگەڵ بکەی جوانترە، سوننەتەکانی جێ بە جێ بکات، سوننەتەکانی بەڕێكو پێکی ئەنجام بدا، چونکە پێغەمبەری خوا-صلی الله علیه وسلم-دەفەرمووێت: لە فەرموودەیەکیدا کە فەرموودەکە قودسیە: "من عادي لي وليا فقد آذنته بالحرب " پاشان دەفەرمووێ: "وما تقرب لي عبدي بشيءٍ أحب إلي مما مفترضته عليه ولا يزال عبدي يتقرب الي بالنوافل حتى احبه" پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- دەفەرمووێ:

خوا دەفەرموێ: هەر کەسێك وەلیەکی خوا ئەزیەت بدا، شەڕی

لەگەڵ من کردووە، بزانە تەماشا. کەسێك ئەگەر گەیشتە مەرتەبەی وەلی خوا دیفاعی لێدەکاتن، هەر کەسێك شەڕی پێ بفرۆشێ شەڕی لەگەڵ خـوا کردیە، شەڕ بەخوا دەفرۆشێ، جا پێغەمبەری خوا(صلاة مى خواى لەسـەر بێ سلام) ئەلێرەدا، بەخۆی ڕێیەکەی ڕۆشن کردیتەوە بە چ ئینسان دەگات بـە وەلی، حەدیـسە قودسـیەکەی تـەواو دەکـاتن خـوای "رب العـزە" دەفەرمووێت: بە هیچ شتێك بەندەکان لە من نزیك نابێتـەوە، بـەوەی کـە لەسەرم واجب کردیە، کەواتە بە نوێژەکان بە ڕۆژووەکان، بـە زەکـات، بـە حەج، بەوانە لە هەموو شتێك زیاتر ئینسان نزیکی خوای گەورە دەبتەوە، پاشان دەفەرمووێت"ولا یزال عبدي یتقرب الی " عەبد هەر لـەمن نزیـك دەبێتەوە زیاتر، بە چی.؟ بەنەوافل" بـەو نوێـژە سـوننەتانە، بـەو ڕۆژیـە سوننەتانە،"حتی أحبە" هەتا وەی لێـدێ کـە خۆشـم دەوێ، کـە خۆشـم ویست، ئەوجا خوای گەورە دەفەرمووێ: " دەبمە چاوی ئەبمە دەستی ئەبمـە قاچی، ئەگەر دوعا بکا قبووڵی دەکەم، ئەگەر هاوارم بۆ بکاتن بە هاواری دەچم، جا بەڕاستی مەعنای ئەوەیە، ئەگەر ئەو کوڕە ئەو کچە دەستی بـۆ هیچ شتێك نابا، ئیلا ئەو شتە خوا پێی خۆشـە، تەماشـای هـیچ شـتێك ناکا، ئیلا ئەو شتە خوا پێی خۆشە، گوێ ی لـە هـیچ شـتێك نـابێ ئـیلا ئـەوەی خـوا پێـی خۆشـە، یـەعنی هـەموو ئەندامـەکانی موتـابیقی فەرمانەکانی خودای"رب العزە" دەبێتن، جـا بەڕاسـتی ئەوەیـە تـەعزیمی شەعائیری خوا، کـە ئینـسان هـەر شـتێك کـە موتـەعلیق بـێ بـەدین،

موتەعلیق بێ بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) موتەعلیق بێ بە شەریعەت، ئەوە زۆر زۆر جوان قەدری دەگری، ڕێزی دەگری، بەگەورەی تەماشا دەکاتن، سێ یەم: نوقتە. سێ یەم سیفەت، سێ یەم نیشانەی ئەهلی نەسرەت، ئەوانەی بەسەر خۆیان‌و نەفسی خۆیاندا زاڵ بووینە، ئەوەیە بەڕاستی تەوەکوڵ لەسەر خوای گەورە دەکەن، ڕازیشن بەو قەزاوقەدەرەی خوای گەورە بەسەریان دەینێتن، لەبەر چی؟

چونکە ئەزانێ قەزاو قەدەری خوای گەورە هەمووی خێرە لە بۆ ئەو ئینسانە هەمووی خێرە ، هەتا نەخۆشی، هەتا بەلاو موسیبەتی هەر خێرە، بەلام ئەو بەس جانیبی ئاخ‌و ئۆف‌و شەڕو ئێشەکەی دەبنیتن، جانیبی خێرەکەی نابینی، وەڵلاهی بڕوا بکەن، هەرچی بەلاو موسیبەت‌و غەم‌و پەژارەیە، هەرچی نەخۆشی هەیە، هەرچی زیان هەیە، کەبەسەر ئینسانی دێ، وەڵلاهی هەموو بە خێر لە بۆ ئەو ئینسانەی دەگەڕێتەوە، ئەگەر ئەو بێت بە چاوێکی ورد بینانە تەماشای شتەکەی بکاتن، جا بۆیە خوای گەورە دەفەرموویتن: لە قورئاندا"ومالنا أن لا نتوكل على الله وقد هدانا سبلنا ولنصبرن على ما أذيتمونا وعلى الله فليتوكل المتوكلون" بزانە ئەو موسڵمانانەی ئەو داعیانەی کە لە دەستی موجریم‌و زاڵمەکان ئەزیەت دەخۆن، ئەشکەنجە ئەدرێن، غەم‌و پەژارە دەدرێن.

ئەوان چی دەڵێن.؟ چ جوابی قەومەکەی خۆیان دەدەنەوە،"ومالنا أن لا نتوكل على الله" چۆن ئەمە پشت‌و پەنای خۆمان بەخوای"رب العزه"

قەیم ناکەین، " وقد هدانا سبلنا" کاتێك کەوا خـوای گـەورە هیدایـەتی داین‌و ڕێ ی پێ پیشان داین،" لنصبرن علی ما أذیتمونا" سـەبردەگرین، بەرامبەر ئەو هەموو ئەزیەت‌و ئازارەی کە کافران‌و بێ بڕوایان‌و تاغوتـان لە بەرامبەر داعیان‌و موسـڵمانان ئـەنجامی دەدەن، پاشـان خـوای گـەورە دەفەرمووێ: ئینسانە موتەوەکیلـەکان هـەر دەبـێ لەسـەر خـوای گـەورە تەوەکول بکەن‌و پشت‌و پەنایان هـەر خـودای"رب العـزە" بـێت، ئینـسان دەبێ دائیمەن، ئەگەر تووشی هەر بەڵایەك غەمەك پەژارەیەك بـوو، هـەر بڵێ:" حسبنا الله ونعم الوکیـل" حـسبنا اللـه" خـوا کـافی مانـە خـوا حەسیبمانە بەسە.." ونعم الوکیل" باشترین کەسیشە کە ئێمە پشتی پـێ ببەستین"ئیبن عبـاس- ڕەزاو ڕەحمـەتی خـوای لێبـێ. دەفـەرمووی: ئـەم کەلیمەیــە"حـسبنا" دوو کـەس گوتوویـەتی: یەکـەمینیان: حـەزرەتی ئیبراهیم" گوتی: کاتێك کە هاوشـیتیانە نـاو ئـاگر، دووەم کـەس-محمـد المصطفی- صلی الله علیه وسلم-گوتی: کاتێك کە لـە شـەڕی ئوحـد زۆر شەکەت‌و ماندوو شپرزە ببون، لەو کاتەی دا کافرەکـان لەجەولـەی دووەم بردیانەوە، لە شەڕەکەدا ئەسرەتی خۆیـان بەدەسـت هێنـا، موسـڵمانەکان حەفتایان لێ شەهید بوو، زۆریشیان لێ بریندارو شەکەت بوو، لەو کاتەدا شەڕەکە کۆتایی هات، بەڵام خەبەریان لە بۆ هات، گوتیان: یا محمد(علیـە صلاة وسلام) خۆیان خڕکردیتـەوە دەیانـەوێ، هوجـوم بکەنـەوە سـەرتان، یەعنی لەو شەکەتیا شەڕ ناکرێ بەڕاستی، بـەڵام چـییان گـوت: یەکـسەر

"الذین قال لهم الناس إن الناس قد جمعوا لكم" بزانە خوای گەورە بەخۆی تەسویری حادیثەکەی کردیە.

دەفەرمووی:"الذین قال لهم الناس"ئەو کەسانەی کەوا خەڵك پێی گوتن:"إن الناس قد جمعوا لكم" وا کافرەکان خۆیان گەلاڵە دایەو خڕکردیتەوە، هوجومتان بکەنە سەریّ،"فاخشوهم" دەی لێیان بترسێن.؟ "فزادهم ایمانا وقالوا حسبنا الله ونعم الوكيل" بەڕاستی گوتیان: ئەوە ئیمانمان پیّ پتەو دەبی، چونکە بڕوایان بە قەزاو قەدەری خوایە، ئەگەر خوامەیلی لەسەر بی دێن، ئەگەر خواش مەیلی لەسەر نەبی نایێن، جا یەکسەر یەکەم قسە لە دەمیان هاتە دەریّ گوتیان:"حسبنا الله ونعم الوكيل" جا با شیعاری ئێوە خۆشەویستانم:"حسبنا الله ونعم الوكيل" بیّ مامۆستا زوڵمی لیّ کردی بڵیّ " حسبنا الله ونعم الوكيل".ئەگەر گاڵتەیان بە حیجابتان کرد بڵێن"حسبنا الله ونعم الوكيل" ئەگەر گاڵتەیان بە ڕدێنتان کرد بڵێن "حسبنا الله ونعم الوكيل" ئەگەر گاڵتەیان بە نوێژتان کردبڵێن " حسبنا الله ونعم الوكيل" ئەگەر إستهزایان بە دینو عەقیدەتان کرد هەر بڵێن"حسبنا الله ونعم الوكيل" باشترین شەعائیری موسڵمانانە لەو سەردەمەی کە بڵندی بکەنو بەرامبەر هەموو دوژمنانو تاغوتانو ئەو کەسانەی کە دەیانەویّ ئەزیەتی موسڵمانان بدەن، خوای گەورەش لە قورئاندا دەفەرمووی، ئەو قاعیدەی لەبەرکەن ئەو قاعیدەی عەمەل پیّ بکەن.

لەسەری بژین کە خوای گەورە دەفەرمووێ:﴿ وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ بزانە شەرت نیە ئەتوو کۆمەڵە ئاواتت هەیە، لەوانەیە بڵێی: ئەو ئاواتانەم لۆ بێتە جێ خەنی دەبم، بەڵام وەش نییە، بەڕاستی ئینسان نازانی ئایا ئەو شەڕە یان ئەو خێرە کامیان خێرە لەبۆی؟! زۆر جاران شەڕەکەی بە خراپ تێدەگا، بەڵام خێریشە بۆی ، بەڵام خێرەکەی بەخێر تێدەگا بەڵام شەڕیشە بۆی:! بۆیە ئاخیری خوای گەورە دەفەرمووی:" والله یعلم وأنتم لا تعلمون" خوا بۆ خۆی دەزانی ئێوە نازانن..سیفەتێکی تریشی ئەو موسڵمانانەی کە بەڕاستی نەسرەتیان دراوە لەو شەڕەدا، سیفەتەکان زۆرن تەقریبەن بیستو سێ سیفەتن خڕم کردیتەوە.

بەڵام ئەوە سیفەتی سێیەمە: باسی دەکەم، ئەوانی تر ئەگەر خوا عومری داین لۆتان باس دەکەم. ئەوەیە بەڕاستی ئەو ئینسانە گوریسی لەبن دونیایێ ڕانەخستووە، ئومێدی زۆر بە دونیایێ نییە، پێی دەڵێن "قصر الامل"یەعنی ئەوەندە بە ئومێد نییە لە دونیایێ، دەعیمارەم هەبی، ئەوەندە دەفتەرم هەبی، ئەوەم هەبی‌و ئەوەم هەبی، هەموو خەیاڵی هەر دونیا بیتن،نەء.. بەڵکو دونیا بەشتێکی‌کاتی تێدەگا، ئەسڵەن یەك ڕۆژیش لەخۆی ئەمین نییە، نازانی ئایا ئێستا نوێژی عەسرێ دەکەین؟ دەگەینە مغریبێ؟ ئەگەر نوێژی مغریبێمان کرد، دەگەینە عیشایێ، ئایا ئەگەر شەو نوستین دەگەینە بەیانی یان نا..؟ چونکە ئەگەر ئینسان ئەوها

نەژی، ئەوە شەیتان زەفەری پێ دەباو لە دینداریەکەی دەگەڕی، دەی دەی زووە هێشتا گەنجم، پەلەم چیە إنشاالله با تۆزێکی ترنە.. خوێندنم تەواوکەم، دەبا ژنێ بێنم، دەبا منداڵم ببی، هەتا ماڵی کاوڵ دەبێ‌و پشتی دەشکێ، نەء جا بەڕاستی ئینسان نازانێ کەنگین (ملك الموت) دێ ڕوحی دەکێشی، ئەو ئومێدەی زۆر بە دونیایێ وەنییە، هەموو کاتێك ئامادەیە کەوا عەمەل‌و کردەوەو چاکەکانی حازر بی، پێغەمبەری خوا فەرموویەتی:-علیه صلاة وسلام-."کن في الدنیا کأنك غریب أو عابر سبیل" لە دونیایێ بژی کە ئینسانێکی غەریبی، یان ڕێبوارێکی، جا بەڕاستی ئینسان ئەگەر خۆی بە غەریب زانی، خۆی بەخەڵکەکەی ماندوو ناکا.

چونکە خەڵکەکەی ناناسی، خۆی بە خۆی ماندی دەکا، کابرای عابروسبیل کابرای کە دەچتە شاری (تاران) چوار پێنج ڕۆژی پێدەچی‌و دێتەوە، خۆ ئەو هەموو موڵك‌و ماڵەی کە هەیتی هەموو ناچی لە تاران دا سەرفی بکا، وانییە..!؟ دەچی کەمێکی دەبا، لەبەرەوەی خۆ خەڵکی تهران نییە، هەر دێتەوە، جا بەڕاستی ئێمەش خەڵکی زەوی نین، ئێمە خەڵکی بەهەشتین، ئێمە شوێنی ئەسڵیمان بەهەشتە، لێرە غەریبین، لێرە ڕێبوارین، دەبێ زۆر زۆر ئاگامان لە خۆمان بی، ماوەکی کورتەو ئێرە بە جێ دێڵین، لە بۆ ماڵی ئەسڵی خۆمان کە بەهەشتە، دەبێ بۆ وێ بگەڕێین، لۆ وێ نرکەو ناڵەمان بێ، لۆ وێ دوعاو نزامان بێ، خۆشەویستانم: ئیبن

عمر -ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ- لە پێغەمبەری خوای گوێ ی لێ بوو، دەیفەرموو:"إذا أمسيت فلا تنظر الصباح" ئەگەر بەیانیت کردەوە چاوەڕوانی ئێواریێ مەکە، بزانە ئەوە،چەند"عظیم"مەبەستی چیە.؟ ئەگەرکاتی نوێژەکە هات، نوێژێکی مەزبووت بکە، کێ دەڵێ نوێژەکی تر دەکەی، پێغەمبەر (علیه سەلاتو وەسەلام) بۆ خۆی ئەفەرمووێ: هەر کاتێك نوێژت کرد،"صلی صلاة مودع" نوێژێك بکە کە ئەو نوێژە نوێژی کەسێکە کە ئاخیر نوێژیەتی،"مودع" یەعنی ئاخیر نوێژ تەواو، توخوا ئەگەر ئێستا بە ئێوە بڵێم: خوشکینە براینە ئەوە ئاخیر نوێژتانەو تەواو، دەمرن.. چ نوێژێك دەکەن.؟

هەر سەلام نادەنەوە مودع.! بە نیو سەعاتی هەر لە سوژدە سەر بڵند ناکەن، دەی کەواتە بزانە هەموو نوێژێك دەکەی ئەوە"صلاة مودع" بێت.. جا ئاوا ئەتوانی بەڕاستی خۆی ئیهتیمام پێ بداو هەرگیز گوناهیش ناکەی، ئەگەر پێت بڵێن کاکە سێ شەمی داهاتوو دەمری.. وەڵڵاهی ئەو حەفتەی ئەتوو گوناهێك ناکەی باشە، بە زەڕەش گوناهێك ناکەی.! دەکەواتە کێ دەڵێ بەیانی نامرین، دوو بەیانی سێ بەیانی مانگێکی تر، نازانین، بەڕاستی کەس دەفتەری خۆی نەخوێندۆتەوە لەو ڕۆژەی دەمری، کەواتە نازانی دە ئاگات لەخۆ بێت، خۆت مەحفوظ بکە، خۆت مەستوور بکە، پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو:"إذا أمسيت فلا تنظر الصباح" ئەگەر بەیانیت کردەوە چاوەڕوانی ئێوارە مەکە."اذا اصبحت فلا تنظر المساء "

بەیانی چاوەڕوانی ئێوارە مەکە، "ومن حیاتك قبل موتك" کاتێك لەشت ساغو سەلیمەو گەنجیو هەموو شتێکت پێ دەکرێ، بەڕاستی عیبادەو زادو زەخیرەیەکی زۆر زۆر ئەنجام بدە، ئەوەکا دوایێ ڕۆژێك ئەخۆشبیو هیچت پێ نەکرێ، هەتا لە ژیانی زادەو زەخیرەیەکی باش دابنێ بۆ قیامەتێ، چونکە ئەگەر مردی پێت ئەنجام نادرێ، خوای گەورە هەموو لایەك مۆفەق بکا، بەخێر بێن سەرچاوان خوای گەورە پشتو پەنامان بێتن، کە بەڕاستی ئەو سیفەتانە لە خۆت بینەجێ، کە ئەهلی نەسرەت، ئەوانەی کەوا بەڕاستی خودای گەورە پشتو پەنایتیان، وە بەسەر نەفسو هەواو شەیتانەکانی خۆیاندا زاڵ بووینە، خوایە لەو کەسانەمان بگێڕی "إنشاء الله"

وصلی الله علی محمد وعلی آله وصحبه وسلم

وأخر دعوانا ان الحمدلله رب العالمين



بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين وصلى الله وسلم وبارك على سيدنا وحبيبنا محمد وعلى اله وصحبه أجمعين..

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته..

ئازیزانم:خۆشەویستانم: پێ خۆشحاڵ بووم ئەوجارەش خوای گەورە تەمەنی درێژ کردین بۆ ئەوەی لە نزیکەوە بە خزمەت یەکتری بگەین، خوای گەورە هەموو لایەك مۆفەق بکا، خوای گەورە سەرفرازی دونیاو قیامەتمان بکا، خوای گەورە یارمەتیمان بدا بە فەزڵو کەرەمی خۆی، باشترین بەندایەتی بۆ بکەین، یارمەتیمان بدا لەو هەموو شەڕو ئاژاوەیەی نەفسو شەیتان بەسەریاندا زاڵ ببین، ئازیزانم: لە دەرسی ڕابردوو باسی ئەو سیفاتو ئەخلاقانەمان کرد، مرۆڤ تێیدا سەرکەوتووە بەسەر شەیتانی دا، مەنسورە لەسەر نەفسو هەواو ئارەزووەکانی دا، چەند سیفاتێکی هەن، گوتمان: ئەو سیفاتانە هەر کەسێك لێی هەبێ، ئەوە دەبێ دڵ خۆشبێ سوژدەی شوکری بۆ ببا، "الحمدلله" خوای گەورە بە فەزڵو کەرەمی خۆی منی ژماردووە، کە یەکێك لەوانە بم، کەوا سەرکەوتووم، بەسەر ئەو شەیتانەی دا، وە بەسەر ئەو نەفسو هەوایەی دا، کە هەمە، گوتیشمان: نەفسوهەوا هەردووك خزمەت کاری شەیتانن، هەردوو یارمەتی دەری



شەیتانن، هەوا خزمەتکاری نەفسە.

نەفسیش خزمەتکاری شەیتانە، جا بەڕاستی ئەو ململانێیە وەك لە دەرسی ڕابردوو بۆم تەئکید کردنەوە دەشمێنێ، بەردەوامە، ﴿وَلاَ يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّىَ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُواْ﴾ جا چ کافر بێ چ شەیتان، ئەوان هەردوو لە بۆیەك شت شەڕ لەگەڵ تۆ دەکەن، تەنها تۆ بێ دین کەن، تەنها ئەو ئەخلاق‌و ئادابەی کە هەیتت لێت بستێننەوە، ئەو ئیمانەی کە هەیتت لێت بستێننەوە، ئەو حیجابەی کە لەبەرت کردیە لەبەرکەنەوە، ئەو سیماو جوانیەی کە هەیتت، کە خواو پێغەمبەری خوا بەنووری قورئان پێیان بەخشیوی، بە هیدایەتی ئیسلام هەدیەو خەڵات کراوە لە بۆت، دەیانەوێ لێت بستێنن، جا بەڕاستی ئینسان دەبێ ئەم ئەخلاقانەی دەیڵێم: ئەو سیفاتانەی دەیڵێم: بە ڕاستی زۆر جوان لە بۆ خۆمان دەستگیری بکەین، قایمی بکەین بە ئومێدی ئەوەی إنشاءالله لە ڕۆژی قیامەتێ لەگەڵ موسلیحان بین، لەگەڵ ئەو کەسانە بین کە خوای گەورە بانگمان بکاتن‌و بەتەنیا حیسابمان لەگەڵ بکا إنشاءالله. یەکەمیان گوتمان: خۆی یەکلاکردیتەوە لە تەوحید، تەوحیدی خودای گەورە، خۆی یەکلاکردیتەوە لەنییەت، خۆشی یەکلاکردیتەوە لە موتابەعە کردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دووەم: سیفەت گوتمان: شەعائیری خوای زۆر بە قەدرو بەهای زۆر گەورەیە لە پێش چاوی، هەموو شەعیرەی دینی خوای

گەورەی پێ گەورەیە، هەمووی تەعزیم دەکاتن، سێ یەم: گوتمان تەوەکولی لەسەر خوای گەورە مەزبووتە، تەواوە، قەناعەتیشی هەیە بە هەموو شتێ کە خوای گەورە پێ ی بەخشیوە، ڕازیشە بە قەزاو قەدەری خودای "رب العالمين" چوارەمیان گوتمان:ئەمەلی کورتە بە دونیا، دڵیشی بە دونیا خۆش نییە، گوریسی لەبن دونیا ڕانەخستووە، بەڵکو هەمو غەمی ئاوەدان کردنەوەی قیامەتە، سیفەتی پێنجەم: گەیشتینە سەر باسی ئەم جارە، ئەوەیە بابایەکی بە قەناعەتە، نەفسیشی دەوڵەمەندە، یەعنی نەفس بەرزە، بە قەناعەتیشە بەوەی کە خوای گەورە بە قسمەتی کردووە، چونکە بەڕاستی نەبوونی قەناعەت، ئینسان دەبێتە تەهلوکە، دەبێتە هۆی ئەوەی دەست بۆ شتێك درێژ بکەی حەڵاڵ نەبی.

شتێك بکەی کە جائیز نەبی، ئینسانیش کە نەفسی بەرز بوو هەرگیز شتی کەم ناکا، ئینسانێك کە نەفسی بەرز بوو هەرگیز نەفسەکەی لێناگەڕێ، ئەو نەفسەی تەبعەن خوا بە پاکی ڕاگرتووە، بە خاوێنی ڕایگرتووە، ئەو نەفسەی "إن النفس لأمارة بسوء" نەفسی "اللوامە"یە نەفسی"المطمئنة" ئەو نەفسە وەت لێ ناکات، هەرگیز شتی کەم بکاتن، پێی سووك بی، کە پێ شەرمەزاربی، جا بەڕاستی هەبوونی ئەو نەفسە، هەبوونی ئەو غیرەتە کە لەناو دڵی ئینسانی دا هەیە، نەك بکەیت بەخۆهاتن بەوەی کەوا عەمەلی باشی کردووە، نا.. حەسبێك کەوا کەیفی

بەوەبێ، شتی کەم ناکا، شتی نارێك ناکات، شتێك ناکات کەوا خواو پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێیان ناخۆشبێ، جا بۆیە پێغەمبەری خوای(ﷺ) فەرموویەتی"لیس الغنی عن کثرة العرض وإنما الغنی غني النفس" دەوڵەمەند ئەو کەسە نییە ماڵی دونیایێی زۆر بی، پارەو دۆلارو درهەمی زۆر بی.

بەڵکو دەوڵەمەند ئەو کەسەیە کە نەفسی دەوڵەمەند بی، دەیبینی کابرا فەقیرە، بەڵام هەرگیز تەزوڵ ناکات لە بۆ درهەمەکی، خۆشەویستانم گەنجانی کوڕ، جگەرە مەکێشن، جگەرە ئەو سیفەتەتان لێ دەسەنێت، ئینسانی شەرمەزار دەکا، نەفسی دەوڵەمەند زەلیل دەکاتن، بزانە تەماشا کابرا نانی نەمێنێ داوا ناکا، ئەوەندە نەفسی گەورەیە قەد داوای پارە ناکات، هەبووە لە قسمی داخیلی بە حەفتە پارەی نەبووە، درهەمی لە گیرفانی نەبووە، داوای لە برادەرەکەی خۆی نەکردیە، بەڵام دوو سەعات سەبری نەبێ لەسەر جگەرە کەواتە. جگەرە دژی ئەو سیفەتە"عظیم"ەیە بۆ جگەرە پیسەو حرامیشە؟ لەبەرئەوەی عەزیزترین شت لە ئینسانی عیزەتە، سەر بڵندییە، دەوڵەمەندی نەفسە ئەو زەلیلی دەکاتن، ئێوە نەیخۆن، چونکە لە دەورەی ئەو گەنجایەتیە جگەرە زۆر بەتامە ئەوها فیکەی لێوە بینن، وا دەزانی شتەکی زۆر خۆشە، ئەوەڵڵاهـ شتێکی زۆر زۆر نابووتە، شتێکی پیس‌و بۆگەنییە، جا بەڕاستی ئینسان بەوەی

عەزیزی نەفس دەبێتن، نەفسی دەوڵەمەند دەبێ، هەرگیز چاوی لە ماڵی خەڵکی نییە، ئەوەی لە دەستە خۆیتی، ئەوەی کە لە دەستی دا هەیە لە هەموو شتێك بە قەدرو قیمەت ترە، ئەوەی هەیەتی لە هەموو شتێك باشترە، دەبینی بەڕاستی هەرگیز تەماعی لە مەنسەبیش ناکا، نەك لە ماڵی دونیایێ، ئەوەندە عەزیزە نەفسی، ئەوەندە بەرزە، ئەگەر برادەرێکی خۆی زیرەك تر بوو دوعای خێری لۆ دەکا، نەك حەسوودی پێ ببا، چونکە حەسوودی خراپە، نەخۆشیە حەسوودی، بەڵام ئەم ئینسانە، ئەو عەزیزی نەفسە زۆر کەیفی پێ دێ کەوا برادەرەکەی لەوی باڵاترە زیرەکترە، بلیمەتترە لەهەر کۆبوونەوەك لە هەر ڕێکخراوێك ئیش بکا، لە هەر شوێنێك شتێکی تر بکا، ئەگەر بزانی لەوی بەقابیلیەت ترە دوعای خێری لۆ دەکاو پێشی خۆشە، چونکە نەفسەکەی عەزیزە، بەڵام ئەگەر نەفسی بۆگەنی بوو، ئەگەر نەفسی زەلیل بوو. "سبحان الله" حەسوودی پێ دەبا، خەمی لێ دەخوا، خەوی پێوە دەبینی، پێی ناخۆشە، دائیمەن لە فکرو خەیاڵی دایە، بەڵام ئینسانی عەزیزی نەفس قەد وانییە..

لەبەرئەوەی بەخۆی قەناعەتی وایە، ئەوەی خوای گەورە دابەشی کردبی لە هەمووشتێك جوانترە، "أهم يقسمون رحمة ربك نحن قسمنا بينهم معشتهم في الحياة الدنيا" خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەوانە قسمەتی گەورەو تەقسیماتی خوای گەورە دابەش دەکەن.؟! ئێمە دابەشمان کردووە..

دەی چەندم بەبەر کەوتووە حەمدو سەنای بۆ دەکەم، هەرگیز سنووری خۆم نابەزێنمو چاویشم لە ماڵی خەڵکی نابێت، جا بۆیە بەڕاستی دەوڵەمەند، دەوڵەمەندی حەقیقی وەکو پێغەمبەر-علیه صلاة وسلام- فەرموویەتی: ئەوەنییە کە تۆ پارەو موڵكو سامانت زۆر بی، نەء.. بەڵکو دەوڵەمەندی حەقیقی زۆر جاران گیرفانی بەتاڵە، بەڵام نەفسی دەوڵەمەندە، هەژاری حەقیقیش ئەوەیە شەرت نییە پارەی نەبێت، بەڵام دەبینی پارەشی زۆرە بەڵام نەفسی زەلیلە، لۆ دینارێك لۆ درهەمێك تەنازول دەکاتن، جا بەڕاستی ئینسان چەند ئەو سیفەتەی لە خۆی بێنێتە جێ، چ پیاو بێ چ ئافرەت، چەند عەزیزی نەفس بی، بە ڕاستی زۆر زۆر لە شەخسیەتی تەکامۆل دەکا، یەك لە سیفاتی ئەوەی کە ئینسان شەخسیەتی هەبی، چونکە شەخسیەتی موسڵمان، کۆمەڵە سیفاتێکی بنەڕەتی هەن کە ئەو شەخسیەتە دروست بووە، ئەو یەك لەوانە نەفسەکەی زۆر عەزیزە ، زۆر دەوڵەمەندە، تەنازول بۆ هەموو شتێك ناکاتن، ئەم نەفسیەتە، ئەم شەخسیەتە، بەڕاستی دەبێت بەقدوە، یەعنی قودوەیە خەڵك چاوی لێ دەکا، بەڵام کەسێك ئەگەر دیتت نەفسیەتێکی قرچۆکی هەبوو، نەفسیەتێکی زەلیلی هەبوو، بە دوای هەموو هەوایەك دەڕۆیی بە دوای هەموو تەماعێك دا دەڕۆیی، بەرامبەرکەمترین باقو بریقی دونیا دەڕوخا، ئەوە قودوە نییە هەرگیز نابێتە قودوە، جا بەڕاستی

بەتایبەت ئەوانەی بانگ هێشتەی دینی خوا دەکەن، دەبی زۆر عەزیز بن، نەکەن هەڵبخەڵتێن، بە ماڵی دونیایێ بە چەند وەرەقەو دۆلارێك، بە چەند مەنسەبێك ڕاست بڕوخێن.

چونکە زۆر جاران بانگەوازکاری زۆر بە قابیلیەت بووە، بەڵام تووشی وەزیفەیەکی دونیایی بووە، تووشی پارەو پۆلێك بووە، تووشی سەیارەیەکی باش هاتووە، دەبینی ڕاست ڕووخاوە..؟ چونکە ئەو نەفسەی زۆر جوان لە خودی خۆی دا تەرتیب نەکردووە تەربییەت نەداوە، داینەمەزراندووە نەفسێکی عەزیزی هەبێ، ئاوا بە ئاسانیو بەزوویی لێی نەڕووخێت، یەك لە هۆکارەکانی نەفس زەلیل دەکا، جوانی دونیایە.. یەك لەو ئەسبابانەی کە بەڕاستی نەفسی ئینسانی پێ دەڕوخێتن جوانی دونیایە، چونکە بڵێینو نەڵێین دونیا زۆر تەئسیری هەیە لەسەر ژیانی ئینسانندا هەتا موسڵمانیش بەشێکە لەو خەڵکەی دەژیتن، دەبێ ئەو ئینسانە نەزەری بەرامبەر دونیا زۆر زۆر جوان قەناعەتی بێ دونیا قۆناغێکی کەمەو دەیبڕیو دەڕوا، چونکە ئەگەر بێتوو تۆ دونیا بەبەردەوام دابنێی.

نا ئەلێرە دەڕوخێیت، بەڵام ئەگەر بە قۆناغێکی کاتی دابنێیی مودەیەکەو دێی لەسەر ئەم دونیایە دەژیو تاقی دەکرێیەوەو دەڕۆیو قەت خۆت نادۆڕێنی، هەرگیز خۆی زەلیل ناکاتن، بزانە تەماشا ئێوە هەمو تەلەبەی کولیەن وەنییە؟ یان لە کولیە دەخوێنن یان لە مەعهەد،

قۆناغێکە دوو ساڵ سێ ساڵ ئەو پەڕی چوار ساڵ دەخوێنی، کۆلێژی پزیشکی شەش ساڵ دەخوێنی، وەنیە؟ بەو شەش ساڵەی تۆ قەناعەتت سەد لەسەر شەش ساڵە دەژی، شەش ساڵ لەم شوێنە دەوام دەکەی جا دانیمەن مەعاوەلە دەکەی تەسەڕوفێکی وا نەکەم ناشیرین بی، لە پێش چاوی تەڵەبە بکەوی وەنیە، خۆت دەپارێزی ئاگاداری هەڵسانو دانیشتنی خۆت دەکەی، دونیا هەمووی وایە، مەرحەلەیەکە ئێمە دێینو دەژینو دەڕۆین، با شتێکی وا نەکەین خوای گەورە لێمان بڕەنجێ، با شتێکی وا نەکەین شەرمەزار بین بەرامبەر خواو پێغەمبەری خوا(علیە صلاة وسلام).. پێغەمبەر(علیە صلاة وسلام) لە فەرمانەکانی لە فەرموودە ئاخیرەکانی ژیانی دا فەرمووی:"فلا تسودون وجهي يوم القيامة" فەرمووی: هۆ ئوممەتەکەم ڕووم ڕەش مەکەن لە ڕۆژی قیامەتێ، ئەمڕۆکە ئەگەر باش نەبین، بەڕاستی ئەگەر نەفسمان دەوڵەمەند نەبی، ڕووی پێغەمبەرمان-علیە صلاة وسلام- ڕەش کرد، ئەو پێغەمبەرە ئینتیزاری ئێمە دەکا کە ڕووی سپی کەین، بە چی..؟

دەست بگرین بە دینەکەی، دەست بگرین بە سوننەتەکەی، دەست بگرین بە شەریعەتەکەی، دەست بگرین بە ڕێبازەکەی، جا بەڕاستی خۆشەویستانم: دونیا زۆر تەئسیری هەیە، یەك لەو شتانەی کە ئینسان لە دونیایێ زۆر پێی هەردەخەڵەتێ، ڕزقە.. یەعنی ڕزق"وەڵلاهی" دەبێ



قەناعەتتان بێ، ڕزق نوسـراپەو کۆتـایی هاتیـە، ڕزقو ئەجـەل دوو شـتن کۆتـایی هاتییـە، وەڵلاهــی ســوودی نییــە ئەوەنــدەی خــوای گــەورە نووسیوویەتی زیاد نابیتن، پێم خۆشە ئـەوە ببتـە عەقیـدە لـەناو دڵتـان، یەعنی ڕزق"ثابت"ە بەخوای بەکەس زیاد نابیو زیاد ناکاتن، ئەو کەسەی قەناعەتی وابێ کە ڕزقی"ثابتـە" وەڵلاهـی هـەرگیز سـەر شـۆڕ ناکـاتن، واللاهی قەد زەلیل نابی، والّلاهی قەد نانی نامەردی نـاخواتن، واللاهـی قەد دەستیشی لۆ ماڵی خەڵکی درێژ ناکاتن، بەڵام ئەو کەسەی کەوا لـەو بیرو بڕوایەدا قەناعەتی کەم بێ، نەزانێتن ڕزقی خوای گەورە داینـاوە ئـەوا زۆر غەڵەت دەکا، غەڵەتی زۆر زۆر دەکاتن، جا بەڕاسـتی دەبـێ ئینـسان قەناعەتی وابێ.

پێغەمبەر(علیه صلاة وسـلام) دەفەرمووێ: کاتێك کـە مـرۆڤ لـەناو زگی دایکی دا دەگاتە چلەی سێ یەم: چـوار مـانگو دە ڕۆژ دەکـا، دوو مەلائیکەت دێن، ڕزقی ئەو دەنوسن، ڕزقو ئەجەلی دەنوسن چەند دەژی و چەندیش دەخۆی، دەی کەواتە والّلاهی خۆت لە دارو بەردی بدەی ئـەتوو چەندت لۆ نوسرایە هەر ئەوەندەیە، شێخ محمد موتەوەلی شـەعراوی-ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبی- یـەك لـە موفەسـیرەکانە چـەند سـالێکە مـردووە. تەفسیرەکی هەیە ناوی "خەوتو شەعراویە" هەتا ئێـستا تـەواو نـەبووە، سی موجەلـە دە یـەك جـوزئـي قورئـانێ موجەلەدەکـە، زۆر زۆر خۆشـە

(سبحان الله) لەو تەفسیرەی دا دەڵێت: کابرای دز کە دەچێتە ماڵەکی دزیەکی دەکا، دە هەزار جونەیهی دەدزی،واتە دە هەزار دیناری دەدزی، دەخوا ئەوە ڕزقی خۆیتی تەواو وەنیە؟ چونکە ئەگەر ڕزقی خۆی نەبایە لە قورگی ئاوانە دەبوو، بەڵام دەڵێ ئەو کابرایە پەلەی کرد، خوا لە بۆی نوسیبوو ئەو دە هەزار دینارە بەس سەبری بگرتابایە، دە هەزار دیناری بە حەڵاڵی بە دەست دەکەوت.. چونکە لە بۆی نوسرابوو، بەس پەلەی کرد چوو بە دزی پەیدای کرد.

(سبحان الله).. ڕزقێك ئی ئێوە بێ ئی کەسی تر نییە، زۆر سەیرە ڕزق بە دەست کەس نیە وەڵلاهی لە بۆتان بێ هەر ئی ئێوەیە ئی کەسی دیکە نییە، جا پێم خۆشە قەناعەتتان"ثابت" بێتن کە ڕزق لە کن خودایە، خوا بە خۆی دابەشی کردیەو چەند بی هەر ئەوەندەیە، هەتا جارەکی لەوانەیەك گێڕامەوە گوتم: لە حەجێ بووین، ئاوی زم زمێم کڕی بوو، ئەو ئاوی زم زمە چوار جلیکانم کڕی بوو، دەیکرد بای سێ سەدو شێست"٣٦٠" دیناری جاران بەسایەق لۆریەکەم گۆت: ئەم چوارە ئی منە ئەگەر لە لۆریت بار کرد، جا هەموو عادەتەن پێش ئەوەی بڕۆن لە مەککەی پێش ئەوەی بچنە مەدینە، هەموو جانتاکانو هەموو ئاوە زم زمەکان لە دەرێ دادەنرێت، لەپێش فندقی لۆری دێ بار دەکات، هاتمەوە نەمابوو، "الحمدلله" وامزانی بارکرایە، ئیی خەڵکی بارکرابوو، کابرام

دیت گوتم: ها.. حاجی بارت کرد، گوتی کوڕە بابە بە دوو ڕۆژی دی سرەم ناگاتە ئێرە هەندم لۆری لە پێشە، کورە ئاوەکان نەمایە بگەڕێ بسورێ مشەوەش بووم، ئاو نەما هەندم غەم خوارد، گوتم: دەوجە وەرە "٣٦٠" دیناری دیکە خەرج کەوە دیسان، ئاوی زم زم بکڕەوە، ئینسان هەر ئینسانە وەکو ئینسان فکر دەکاتەوە، بزانە لێرەدا خوا کو زلەکی میهرەبانی لێدام، چونکە زۆر جاران خوای گەورە، زلەکی میهرەبانی لەعەبری خۆی دەدا، ئەوها نییەو ئەوهایە، ئێمە بگەڕێو بسورێ بڕوا بکە دە لۆریم کرد، ئەو ئاوەی منی تێدا نەبوو، جلیکانەکان تایبەتی بوو، لۆلەی هەبوو دەمناسیەوە، تێیدا نەبوو سەرەنجام زۆر غەمم خوارد نوێژی عەسرێم لە بەیتێ نەکرد یەعنی لە نیوەڕۆ وە هاتمەوە نەما بوو، نوێژی عەسرێم لە بەیتێ نەکرد هەر گەڕام لە کن فندقەکەی خۆمان، مزگەوتەك هەبوو نوێژی عەسرم لەوێ بە جەماعات کرد.

بەغەمباری چوومە بەیتێ (واللە) نەگەیشتمە بەیتێ هێشتا زۆر مابوو بانگی دا، هەر بانگی دا ئیتر ڕاست تەواو جادەو شت قەتع دەبی یەکسەر نوێژ دادەبەسترێ، (واللە) ئەمنیش مقەبایەکم ڕایەخست نوێژم دابەستا، کابرایەك هات لە تەنیشتم نوێژی دابەستا بستەك لەسەر سەرێ من بوو پێست ڕەش دشداشەکی کورت لاقی دیاربوو لە ژێر دشداشەکەی لاقی ڕەش، جەفیەکەشی بەردابۆوە نوێژی کردو (واللە) سەلامان داوە،

گوتی: عیراقی؟ گوتم: نعم.. پێنج سەد ریالی دامێ یەعنی دوو هەزارو پێنج سەد"٢٥٠٠" دیناری نەسلی (والله) ڕاست ڕۆیشت.. گوتم: خودای"عظیم" ئەمن زۆر غەریب بووم، ئەمن غەمو پەژارەم خواردووە"٣٦٠"دینارم لەدەست چوو، بەس حەیفە پیاو لە کن(ملك الملوك) کە "الله"یە کە ڕزقی ئەم دونیایەی لە دەستە، غەمێ بخوا لە بۆ سێ سەدو شەست دینار خوا فەرمووی: ها مەلا شێرزارد ئەوا پێنج سەد ریال بە چ دەدەی لۆ خۆت بکڕە باشە، جارەکی تر غەمبار نەبی.

(سبحان الله) "رزق ثابت"ە لە لای خواوە، بڕۆ بە مەعامەلە چیەکان بلێ بزانە کابرا هەبووە ..! لە بۆ ڕزقەکەی ڕۆییە لۆ مەعامەلەکی بە قسمەتیشی نەبووە، هەبووە لە مالێ دانیشتی یە خوای گەورە لە بۆی هینایتە مالێ، جا دەبێ قەناعاتتان هەبێ ئەم بوونەوەرە وەللاهی هەموو خوا ڕزقی دەدا، ئەو هەموو حەیواناتە بە ملیۆنەها گیانەوەرو زیندەوەر، هەموو خوا ڕزقی دەدا تۆ نازانی..هەر خوا بۆ خۆی دەزانی ئەو بوونەوەرەی چۆن ڕزق دەدا، توخوا خوایەك بی ئەو هەموو دونیایە لە بیر نەکا، چۆن تۆ لەبیر دەکا، تۆ ڕۆژێ حۆدەی لۆ دەبەی‌و دەلێی" سبحان ربی الأعلی" چۆن تۆ لەبیر دەکا، موستەحیلە.. بەڕاستی ئینسان کە قەناعەتی هەبوو، لە کن خوای رزق "ثابت"ە نە زیاد دەبی نەکەم، هەرگیز کەم ناکا، قەد چاوی نابڕتە مالی خەلکی، قەد تەنازولیش ناکات



لە بۆ دونیایێ، بەڵکو دەزانی ئەم شتە بڕاوەیە، ئەگەر خوای گەورە لۆی بینی هەر دینیتین، تەماشا ئەو ئایەتە زۆر"عظیم"ە خوای گەورە دەفەرمووی: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ إِلاَّ عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا﴾ هود: ٦ هەرچی لەسەر زەوی دەڕوا"ما یدوب علی الأرض" ئەوەی لەسەر زەویە، ئەوەی لەسەر دەریایە، ئەوەی لە ئاسمانە، هەر هەمووی ڕزقی لەسەر خوایە،" ویعلم مستقرها ومستودعها" خوای گەورە دەیزانی ئەوە ژیانی چۆنو لەچی ئیستقرار دەکاو لە کوێ دەڕواو لە کوێ بە جێ ی دێڵی" کل في کتاب مبین" هەمووی لە کتابەك لە (لوح المحفوظ) بەیان کرایەو نووسرایە، دە توخوا مادام ئەم ژیانەی ئێمە کە "ثابت" بیو لای خوای گەورە نووسرابی، ڕزقەکەمان چەندە، دە توخوا ئەو غەمو پەژارەی لۆ چیە.؟ لۆ دونیایێ..

ئەو هەموو گریانو ڕۆ ڕۆیەی ناوێ لۆ دونیایێ، جا بەڕاستی پێم خۆشە ئەم شتە دروست بی لەبەرئەوەی زۆربەمان لەو ڕێگایەوە شەیتانو نەفسو هەوامان ئەلێرە زەربەمان پێ دەکەویتن، یەك لە سیفەتەکانی تر، سیفاتی شەشەمی: ئەهلی ئەسرەت، ئەوانەی کە بەڕاستی خوای گەورە یارمەتی داینە، لەسەر شەیتانو نەفسو هەوایان بەسەرکەتینە، عەفیفن.. (عفیف) بەو کەسەی دەڵێن کە داوا لە خەڵکی ناکا، لەگەڵ (عفة) جودایە، ئەوی تر یەعنی "غنی النفس" واتە بەخۆی خۆ ڕادەگری، بەلاّم

ئەوەیان قەد شتێك لە خەڵکی داوا ناکات، خەڵك تەماشای دەکا وەدەزانی دەوڵەمەندە، بەخۆشی بەڕاستی زۆر دەست کورتو فەقیرە، ئەوەتا خوای گەورە بزانە بەخۆی وەسفی هەندێك لەهاوەڵان دەکا، دەفەرمووێ:﴿ لِلْفُقَرَاء الَّذِينَ أُحصِرُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ لاَ يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِي الأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أَغْنِيَاء مِنَ التَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَاهُمْ لاَ يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ﴾ البقرة: ٢٧٣.

واتە: دەفەرمووێ: ئەو فەقیرانەی کەوا گەمارۆ دراینە، لە پێناوی خوای گەورەدا ناتوانن بگەڕێنو بسوڕێن شت پەیدا بکەن،"یحسبهم الجاهل أغنیاء من التعفف" کابرای نەزان وە دەزانی کورە ئەوە زۆر دەوڵەمەندە، چونکە چییە..؟ داوای لە خەڵکی ناکا.. وادەزانن ئەو کەسە فەقیرە ئیلا داوا بکاتن، پاشان دەفەرمووێ:" تعرفهم بسیماهم" بەڵام ئەوە لە شکلو شێوەیان دیارە، واللاهی زۆر فەقیرو دەست کورتن،"لا یسألون الناس إلحافا" هەرگیز داوا لە خەڵکی ناکەن، ئەوەندە نەفسیان عەزیزە، ئەوەندە عەفیفیان، عەفافەتیان بەقووەتە داوا ناکەن، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێ:" وما تنفقوا من خیرٍ فإن الله به علیم" تۆ هەر شتێکت دا لە پێناوی خوای گەورە لە خێردا، ئیلا خوای گەورە پێی دەزانێتن، جا بەڕاستی ئەو سیفەتە زۆر عەزیمە، خاسەتەن بۆ گەنجان، عەفیفی پاکی بەتایبەتی بەرامبەر ئافرەتان، پیاو دەبێ زۆر عەفیف بێ، نەفسی خاوێن

بێ، زۆر چاوی خاوێن بێ، نەفسی خاوێن بیێت، چونکە تۆ دەچیە مالّی خەڵکی وەنیە..؟ لە مالّی خەڵکی نان دەخۆی، لە مالّی خەڵکی نمەك دەکەی، دەبی زۆر زۆر چاو پاكو دەست پاك بیت، چونکە عەفیفی هەر ئەوەنییە داوا لە خەڵکی ناکەی، بەڵکو چاویشت پاکە بەرامبەر خەڵکی، ئافرەت هەموو بە خوشکی خۆت دەزانی، هەموو بە دایکی خۆت دەزانی، چونکە لە کۆمەڵگەی ئیسلامی وایە، ئافرەتەکان هەموویان خوشکمانن، کوڕەکانو پیاوەکانیشیان هەموویان برامانن، ئەوهایە کۆمەڵگەیەکی پاك دەردەچیێت، بەڵام وەرە لە غەیری کۆمەڵگەی ئیسلامی بڕۆ دەرێ، ئەو ئەمانایە نییە! خەڵك هەتا چاو تەماشا دەکا، بە هەزاران غەرەزو بوغز تەماشات دەکاتن، هەر کە تەماشای دەکەی هەزاران خەیالّی خراپی لێ دەکاتەوە، ئەوە لە عەفیفی نییە. ئاگاتان لێبێ، ئینسانی عەفیف ئەوەیە دائیمەن، هەم عەفیفە بەرامبەر بە مالّی خەڵکی، داوا لە خەڵکی ناکا، هەم عەفیفە بەرامبەر بە ناموسی خەڵکیش، تەماشای ناموسی خەڵکیش ناکاتن، ئەوە زۆر گرنگە، بەڕاستی دەبی گەنجان ئێوە زۆر عەفیف بن لەم بابەتەدا، چونکە پاداشتی گەلەك زۆرە ئەو کەسەی ئەو سیفەتەی لێ بێتە جێ، سیفەتی حەوتەم: ئەوەیە کە موتەواضیعە، زۆر زۆر موتەواضیعە، هەرچەندە گەورە بێتن، هەر زۆر زۆر موتەواضیعو زۆر بەساکاری دەژیتن، گریمان هەر چ پلەو پایەیێکی دونیاییێ هەبیتن، هەر

چەندە دەوڵەمەندیش بیتن، هەرچەندە کوڕی فلان‌و کچی فـلان بـێ، بـەلام دەیبینی زۆر زۆر سـادەو سـاکارە لەگـەڵ خەڵکی،چـونکە "سـبحان الله" سروشتی مرۆڤ وایە، ئەگەر بڕەك پارەی زۆر بوو، یان بابی دەوڵەمەند بوو، یان عائیلەیەکی ناودار‌بوون دەبینی تەسەڕوفات‌و هەستان‌و دانیشتی بڕەك فەرقی هەیە، یەعنی بڕەك خۆی تەحفوظ دەکا، یـەعنی خـۆی لەقوتابیـە فەقیرەکان ناگەیەنی، مەرحەبا لە هـەموو کەسـەکی ناکـا، یـان دەبینـی سەیارەیەکی هەیە، خوا سەیارەیەکی پێدایە، سەلام لـەو کەسـانەش ناکـا لەگەڵیانە، ئەوە زۆر زۆر سیفاتێکی خراپە، ئینسان دەبـی بەڕاسـتی ئـەم شتانە بە نیعمەتی خوای گەورە بزانی.

پێغەمبەری خوا-علیه صلاة وسلام- دەفەرمووی:" ما زاد الله عبداً بالعفوا الا عزا وما تواضع أحد لله إلى الا رفعه"  واتـە هـەر کەسـێك کەسێك عەفوو بکاتن کە بەرامبەری شتێکی کردبـێ، ئـەوە ئـیلا خـوای گەورە هەر بەرزی دەکاتن،کەسێکیش تەواضوع بکا لە پێناوی خـوای لـە ڕاهی خوای ئیلا خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە، ئەوجا بەڕاستی تەواضـوع زۆر عەزیمە، سیفەتێکە ئینسان کەم هەیە بتـوانی لـە خـۆی بینتـە جـێ، لەبەر چی..؟ چونکە دەبینی سـنووری نەفـسمان قابیلیـەتمان، بـۆ نموونـە ئەوەیە ئەگەر دەفتەرەکم زیاتر هەبی تەکەبور دەبم یەکسەر، بەخۆم نەفس‌و هەوام بلند دەبی، دەست بە تەکەبور دەکەم، بەلام هەیە بـە دوو دەفتـەر،

یەکێکی تر بە سەد دەفتەر، جا هەر یەکی قابیلیەتی نەفسە، جا (سبحان الله) ئینسان داوا لە خوای گەورە بکا، ئەوەندەی بداتێ پێ تووشی تەکەبوری نەبێت، ئەگەر گەیشتە ئەو حەددەی کە تەکەبور بدەیت نەتەوێ باشە! چونکە هەنگی بووە مایەی ئەوەی ماڵەکە ببتە غەزەب هەرگیز ئێوەش نەکەن کەسێك کە تۆزێك لە یەکێکی تر زیرەك ترە، یاخود بەهرەدارترە، یان لەناو ئافرەتان برێك جوانترە، برەك خاوێنو باوێن ترە، یان خوا پێداوترە، بەڕاستی نەکەن ئینسان لەو حاڵەتەدا تەکەبور لێ بدا، یان کەیفی بە خۆ بێ، یان نازو فیز بکا لەسەر ئەوەکانی تر، بەڕاستی ئەوە گوناهێکی گەورەیە زۆر وریای خۆمان بین، ئەوەتا پێغەمبەری خوا-علیه صلاة وسلام- ئەو وەختی کە قائیدی بەرزی دەوڵەتی ئیسلامی بوو لە مەدینە، پیرەژن دەهات، یەك سەعات قسەی لەگەڵ دەکرد کەسیش غەمبار نەدەبوو.

دەی ئێمە کامە مەسئول دەتوانی لەسەر جادەی لەگەڵ پیرەژنەکی ڕابوەستی.؟بەخوای هەر سەلامیشی لێ ناکاتن، هەر بێزیشی نایە، کابرا دەبینی "مەسئول"ە وەختی خۆی فەقیر بووە، زۆر دەست کورت بووە، ئێستا قیچەك خوا پێی دایەو کورسیو مەنسەبێکی هەیە، سەلام لە برادەرە عەزیزەکانی خۆشی ناکاتن، سەلام لە خزمی خۆشی ناکا، خزمی خۆی هەر بە هیچ دانانێ، تەماشا ئەوە هەمووی تەکەبورە، جا بەڕاستی

ئینسانی موسڵمان دەبی وەکو پێغەمبەری خوا بـی،(علیـه صـلاة وسـلام) ئەم پێغەمبەرە زۆر زۆر تەواضـوع بووە، هەتا کە پیرەژن هاتینە ماڵی زۆر ڕێزی لێگرتینە، زۆر حورمەتی گرتیە، عائیشە فەرموویەتی: یا رسول الله ئـەو پیرەژنـە، ئـەوە کێیـە؟ فەرموویـەتی: ئـەوە لـە زەمـانی خەدیجـە هاموشۆی دەکردین، ئەوەندە بە وەفا بووە، ئیی ئەو وەختی لـەبیر بـووە، واڵلاهــی ئــەمن حادیــسەك هــەبوو، زۆرم پــێ ســەیر بــوو، ڕەئیــسی مونافیقەکانی شاری مەدینەی کێ بوو،؟"عبداللەی کوڕی ئوبەی" وەنیە؟ "عبداللــەی کــوڕی ئوبــەی" کــە مــرد پێغەمبــەر(ﷺ) عــەبای خــۆی بەسەردادا، لام سەیر بوو! دەمگوت ئەوە ڕەئیسی مونافیقەکانە، ئـەوەی ئەو بە پێغەمبەری کردیە(علیە صلاة وسلام) دوژمنەکان ئەوەنـدەیان پـێ نەکردیە، ئەوەندە موشـکیلەی بـۆ دروسـت کردیـە، بـەڵام کـە مـردیش پێغەمبەر(ﷺ) عەبایەکەی خـۆی بەسـەردادا، دەزانـی لەبەرچـی؟ لەبـەر ئەوەی کە "ئیمامی عباس"ی مامی پێغەمبەری(ﷺ) لە شەڕی ئوحد بە ئەسیر دەگیرێ سـەرمای دەبـێ ئـەو (عبداللـەی کـوری ئوبەیـە) شـەوێ عەبایەکی خـۆی دەداتـێ، ئـەویش خـۆی پـێ گـەرمی دەکاتـەوە، بزانـە تەماشاکە ئەوە زۆر تەواضوعییە، ئەتوو کابرایـەك دوژمنـی خۆشـت بـی ئەوجا لە بیرت بی‌و وەفاداربی، چاکەکەی لەگەڵ بکەیەوەو بیدەیەوە، ئێمە دەڵـێین: سـندانی لێبـدا تـۆبی، لـە کۆڵمـان بـۆوە لێیگـەڕێ، بەڕاسـتی

پێغەمبەری خوا-علیه صلاة وسلام- یەعنی تەواو بۆخۆی پێغەمبەرێك بووە، بۆخۆی ئینسانێکی زۆر موتەکامیل بووە، موسڵمان دەبی چاوی لێ بکاتن، جا بۆیە یەك لە عەلامەتی تەواضوع ئەوەیە ئەگەر کەسێك منداڵێکیش بوو رەخنەی لێ گرتی قبوڵی بکە.

ئەوە یەك لە عەلاماتەکانە، ئەگەر یێکەکی زۆر لە تۆ بێ موستەوا تر شتێکی فێر کردی لێی وەربگرە، ئەوە شایەدم تەواضوعت هەیە، هەتا جارەکی گوتم: کاکی من ئەگەر ئێوە لەکۆڕێکی گشتی نەك وەکو ئێوە عامەبوو، گوتم: ئەگەر دەتانەوێ خۆتان بناسن، دوو مەسینەی لە بازاڕی بکڕن، بیبەنەوەماڵەوە، شەرتبی ئەگەر ئەنگۆ توانیتان ئەنگۆ تەواضوعتان هەیە، تەبعەن ئەمن بەخۆم نەمتوانی!، ئینسان دەبی بەڕاستی ئەو سیفەتەی ئەگەر هاتوو منداڵێك کەسێك نەقدێکی لێ گرتی بزانە تەحەمول دەکەی، ئەگەر تەحەمول بکەی تەواوە، تۆ ئەهلی مەنسوری ئەوە فیعلەن لەو سیفەتەی دامەزراوەو ڕێكوپێکی، ئەما ئەگەر سووربوویەوە زللەکت لەبن گوێی داو خۆت لێ تووڕەکرد، بەڕاستی بزانە موتەواضوع نی‌و ئەو سیفەتەت لێ نییە، سیفەتی هەشتەم: یەك لەو سیفاتانەی ئەهلی نەسرەت ئەوانەی کە بەڕاستی خوای گەورە نەوسرەتی پێ بەخشینە، ئەوانە لەگەڵ ئیمانداران زۆر بە بەزەیینە، ئەمە بزانە خوای گەورە چونکە بەخۆی ئەمری پێ کردینە، دەفەرمووێ: "وخفض جناحك

لمن إتبعك من المؤمنين"

خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەی موحەمەد(علیه صلاة وسلام) تۆ زۆر نەرمونیان بەو باڵی خۆت ڕایەخە بۆ ئەو کەسانەی بۆ ئەو ئیماندارانەی بەدوات کەوتینە، بەڕاستی ئینسان دەبی لەگەڵ ئیمانداران، لەگەڵ خەڵکی موسڵمان، لەگەڵ ئەوانەی کە هاودینتن، هاو غەمتن، هاو بیرتن، دەبی زۆر نەرمونیان بی، نەك بەرق و قینەو بوغزبی، بەلاّم لەگەڵ کافران و بێبڕوایان و ئەهلی بێ دین لەگەڵ وان زۆر دڵ خۆش و بەکەیف و سەفاو مەرحەباو گفتوگۆبی، نەء .. ئینسان دەبی لەگەڵ ئەهلی ئیمانی خۆی لە هەموو کەس ئەرمونیان تر بێتن، جا بەڕاستی ئینسان دەبینی ئێوە کۆمەڵە کەسێکی دیندارن وەنیە.؟ پێکەوە یەکتریتان خۆش دەوێ، دەبێ ئەنگۆ لە هەموو کەسێك بەرامبەر یەکتری بەرەحم تر بن، بەلاّم لەگەڵ خەڵکی دیکە کە بێ دینە کە ڕووی لە دین نییە، کە ئیدعای غەیری دین دەکاتن، کە بانگ هێشتەی غەیری دین دەکا، بەڕاستی حەق نییە لەگەڵ ئەوان ئەوەندە بە لوتف و کەرەم بن کە ئەو لوتف و کەرەمە، حەق وایە لەگەڵ موسڵمانان ئەوەندە بە لوتف و کەرەم بن.

جا ئەو سیفەتە زۆر جاران لە ناومە نامێنێ، کابرا ئەوەندە کەیفی بە برادەرەکی بێ دینی دێ، دەبینی ئەوەندە کەیفی بە برادەرەکەی خۆی نایە کە ئەهلی مزگەوتە، کە دێ نوێژی دەکا لە مزگەوتێ، یا خوشکێك



ئەوەندە لەگەڵ ئافرەتێکی سفوور هەڵدەستیٚ‌و دادەنیشی ئەوەندە چاکە لـە بۆی، لەگەڵ حیجابێك ئەوەندە ڕوو خۆش نییـە! ئەوەنـدەی ڕووی نـاداتیٚ، ئەوەنـدەی یارمـەتی نـادا، ئەوەنـدە سـەلیقەی لەگـەڵ نییـە، نـەء .. بەپێچەوانەوە ئەسڵەن جاریٚ کامە ئەهلی دیـنتن ئـەهلی تـەقوان، ئـەهلی مزگەوتن، ئەهلی کارتن لە ئیسلامدا، دەبیٚ بەڕاستی تۆ لەگەڵ وانە بیـت بە لوتف بی، لەگەڵ وانە بە مەرحەمەت‌و لوتف بی‌و قسەت خـۆش بـیتن، جا بۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە هـەموو خـەڵکی ئـەو سـیفەتەی زیـاتر بـووە، (سـبحان الله).. لەبەرئـەوەی خـوا ئـەمری پـیٚ کـردووە، دەفەرمووێ:"واخفض جناحك" ئەی محمد (ﷺ) باڵی بەزەیی خۆت، بـاڵی بە ڕەحمەتی خۆت ڕابێخە بۆ ئەو کەسانەی کە بـەدوات دەکـەون، چـونکە تەواو ئەو موسڵمانە ئەهلی دینتە، ئەوە هاوبیرتە هاو فکرتە، هاو کارتە، کەواتە چۆن دەی گۆڕیتەوە بە یەکەکیدیکە کە بڕوای بەو دینە نییـە، تـۆ هەڵت گرتووە، بڕوای بەم جل‌وبەرگە نییەکە ئەتوو لەبەرت کـردووە، چـۆن بەوە دەی گۆڕیتەوە.؟ چۆن لەگەڵ وەی پیٚ دەکەنی‌و پیاسە دەکـەی، بـەڵام سـەلامیش لـەوە ناکـەی ، بەپێـچەوانەوە، بـەڵکو دەبـی ئـەوە لەگـەڵ دیندارەکەی، لەگەڵ ئەهلی حیجابەکەی، زۆر زۆر بە لوتف ترو کەرەم تـرو ڕێك‌وپێك تر بیتن.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە سیرەی دا هاتییە دەفـەرمووێتن دەمویـست

نوێژێ بکەم، نوێژەکی دوورو درێژ بکەم، بەڵام گوێم لە گریانی منداڵێك دەبوو، نوێژەکەم کورت دەکردەوە، ئەمە ڕەحمو بەزەییە، ڕەحمو بەزەییە بە ئیمانداران، دەیفەرموو: ئەوەکو منداڵێك دایکەکەی لە جەماعەت بێ، ئەویش شیری بووێ، نوێژەکەی زوو تەواو کەم دایکەکەی پێ ڕابگات، لە نوێژی جەماعات بووە. لەسوژدەدا ئیمامی حەسەنو حوسێن هاتینە سەر ملی هەڵنەستایە بە نیو سەعات لەسەر ملی بووینە هەر هەڵناستایە، هەتا ئەوان ئاخیری لاکەتینە ئەوجا هەڵسایەو سەری خۆی بڵند کردیە، یەعنی ئەو ڕەحمو بەزەییەی ئەو شەفەقەی، هەتا لەگەڵ موسڵمانان لەو پەڕی نەرمو حلیمی بووە، لەو پەڕی شەفەقەتی بووە، واللەهی کەسی عاجز نەدەکرد، یەك لە شاعیرەکان دەڵێتن: ئەگەر کەلیمەی "لا" لە "لا الە الاالله" نەبایە قەد کەلیمەی "لا"ی بەکارنەدەهێنا ئەو"محمد"ە – صلی الله علیە وسلم"- بە حەیاتی کەلیمەی"لا"ی بەکارنەدەهێنا، کابرای ئەعرابی ئیی بیابان کەللە ڕەق مێشك هیشك، بێ تەبیعات هاتییە، وا پێغەمبەر(ﷺ) لەسەرو ولاخیە، ئەو عەبایەی لەسەر شانی بوو مەرەزبووە، ڕەنگی وەکو کلی بووە، لە مووی بزنو حوشتری دروست دەکرێ.

یەعنی زۆر دڕە نەرم نییە، ئاوا ڕایکێشا هەمرو ملی داماڕا گوتی: بدێ یا (محمد) ئەوەی خوا پێی داوی، تەماشا لەو ئوسلوبەی، ئەمە باین

دوو سێ زللەی موستەحەقمان لێدەداو دەمانگۆ بە پیاوانە داوا بکا، دووەمیش بڕۆ نیتمان، بڕۆ بڕۆ شەش مانگیتکە وەردەوە، پێغەمبەری خوا ئاوا بە پێکەنینەوە تەماشای کردیە، فەرمووی: کاکە بڕۆن شتەکی بدەنێ، بزانە وەڵلاهی پێغەمبەری خوا(ﷺ)غەنائیمی دابەش دەکرد، یێکەك گوتی: "یا محمد" "أعدل" بەعەدالەت تەوزیع بکە، بزانە ئەو قسەیەی، ئەو قسە گەورەیەی! فەرمووی لە خوای بترسە، ئەگەر ئەمن بە عەدالەت تەوزیع نەکەم، ئەی کێ بە عەدالەت تەوزیع دەکا؟ بزانە ئەوانەی لەگەڵت ئیش دەکەن، ئەوانەی لەگەڵتن دەبی زۆر نەرمو نیان بی لەگەڵ یان، نەك لەگەڵ وانە ترشو تفتو تاڵ بی، لەگەڵ خەڵکی بێ دینیش ڕووخۆشو بە لوتف بی، نەخێر.. بە پێچەوانەوە، دەبێ لەگەڵ بێ دینان هێندە ڕوویان نەدەیتێ زۆر موجامەلەیان نەکەیت، چونکە ئەوانە هەر ئەسڵەن بڕوایان بە دینەکەی تۆ نییە، بڕوایان بەو قەناعەتەی نییە کە تۆ بڕوات پێی هێنایە، بڕوا یان بەو حیجابەش نییە پۆشیوتە.

ئەسڵەن تۆ بەمێشك پووچ دەزانن، دەی کەواتە مادام ئەو ئەمن بەکەم بزانی، ئەمن دوو قات ئەوی بەکەم دەزانم، ئامادەش نیمە لەگەڵی بچم دانیشم، لە گەلی پێبکەنم، بەڵکو لەگەڵ موسڵمانەکەی پێدەکەنم، چونکە پێکەنینم بەرامبەر موسڵمانەکەی صەدەقەیە (تبسمك في وجه أخيك صدقة) نەی فەرمووە " في وجه عدوك" پێکەنینت بەرامبەر

موسڵمانەکە چاکەو خێرت بۆ دەنوسرێ، ئەوەندە بەسە هەندێ سیفاتەکان ماون، بە ئیزنی خوای گەورە لە ئەڵقەکانی داهاتوو باسیان دەکەین، خوای گەورە یارەبێ پشتیوانمان بێ، بتوانین بەراستی ئەو سیفەتانە لەخۆمان بهێنینە جێ، لە خۆمان کامڵ بکەین، بە ئومێدی ئەوەی ئەهل بین، کە بەسەرشەیتانو نەفسو هەوادا زاڵ بین، لەو شەڕەدا ببەینەوە، بەتایبەتی ئێوەی گەنج، لەئێستا وەخۆتان پەروەر دەکەن خۆتان کامڵ بکەن، دەبی ئینسانی موسڵمان کەسایەتیەکی ڕێكوپێك بۆ خۆی دروست بکا، کەسایەتیش بە دوو شت دروست دەبێ.

بە نەفسییەتی ئیسلامی، بەعەقلی ئیسلامی، بە نەفسییەتی ئیسلامی ئەوەیە کە چەند ئەخلاقی ئەهلی نەسرەت هەیە کە باس دەکەین، لە خۆت بینە جێ، بە عەقڵی ئیسلامیش ئەوەیە بە بیرو باوەڕێکی ئیسلامیو ڕێكو پێكو ئیمانێکی دامەزراو لە خۆت هەڵگری، هەرچەندە لە دەرسەکانی تریش باسم کردووە، کەسایەتی ئیسلامی چۆن دروست دەبێ؟ بەتەنیا لەوانەیەکی تایبەتی بەتەنێ بۆتانی باس دەکەین، خوای گەورە هەموو لایەك پایەدار بکاتن...

وسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته



## بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين وصلى الله وسلم وبارك على سيدنا وحبيبنا محمد وعلى اله وصحبه أجمعين..

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته..

پێ خۆشحالّم کە خوای گەورە تەمەنی ئێمەی درێژ کردەوە، کە ئەمجارەش بە ئێوەی بەڕێزو خۆشەویست بگەم، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە بتوانین یارمەتی یەکتری بدەین، پشتیوانی یەکتری بکەین، زیاتر خۆمان برازێنینەوە بە ئەخلاقە جوانەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) زیاتر ئەو فەرموودانەی خوای گەورە بەئێمەی فەرمووە زیاتر جێ بەجێیان بکەین، زیاتریش دلّسۆزیو هیممەتمان هەبێ، بۆ حزمەت کردنی ئەم دینە، أنشاءالله" ئێمە هەر لەم زنجیرە دەرسەدا ئێستاش وا خەریکی ئەو سیفەتو ئەو خوورەوشتا نەیین کە مرۆڤ لە نەفسو شەیتان ئەیباتەوە، باسی ئەو ئەخلاقانە دەکەین، کە چین.؟

چونکە بەڕاستی ئەو ئەخلاقانە بڕبڕەی پشتی مرۆڤی سەرکەوتوون، هەر بەو ئەخلاقانەیە مرۆڤی پێ سەرکەوتووە، ئەگەر بێتوو پیاوی سەرکەوتوو لەو ئەخلاقانە دابڕێ ئەوە یەکسەر توشی نەکسە دێتەوە، تووشی بەلاّو موسیبەتەکەی جارانی خۆی ئەبێتەوە، گوتیشمان ئەم شەڕە شەڕی مانو نەمانە، دەبێ ئینسان زۆر بەجدی فکری لێ بکاتەوە، زۆر بە خولّقوو هیممەتەوە لۆی بچیتە مەیدان، لەبەرئەوەی ئەو شەیتانە، ئەسلّەن

نایەوێ تۆ چاوت بە بەهەشت بکەوی، ئەسڵەن نایەوێ تۆ یەك دەنکە ڕەحمەتی خواشت بە بەربکەوێتن، ئەم شەڕەت لەگەڵ دەکا، هەرچی خێرو بەرەکەتو خۆشیو گەورەییو عیزەتە لە تۆ بستێنی، ئەوەی زیللەتو نەگبەتی و بەلا هەیە، بەسەرە تووی دابهێنێ، جا بەڕاستی دەبێ تۆ زۆر وریابی لەم شەڕەدا، خوای گەورە بۆ خۆی دەفەرموویتن:" إن الشیطان لکم عدو فاتخذوه عدوا" ئەی خەڵکینە شەیتان دوژمنی ئێوەیە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی بزانن، زۆر غەدرە کابرا شەیتانی بەدۆستی خۆی بزانی.

زۆر ستەمە کابرا لە شەیتان ئەمین بی، چونکە هەر ئەو فێڵوحیلەی شەیتانی بوو کاتێك کە لە بابە"ئادەم"ی نزیك بۆوە (علیه السلام)، چی پێ گوت؟ گوتی:"إنی لك ناصح أمین" بزانە ئەو برادەرە دڵسۆزە،" إنی لك ناصح أمین" من هەم ئامۆژگاریت دەکەم پاشانیش زۆر ئەمینیشم لەئامۆژگاریەکەم، هەرچی حەقو ڕاستو دروستیەو ڕێكو پێکیە بە تۆ دەڵێم: هەر چەندە ئەوەی خوارو خێچو قوڕ بەسەری بوو پێی گوت، جا بەڕاستی ئینسان دەبی زۆر ئاگای لێبی بەو مواسەفاتانەی کە باس دەکەین، چونکە ئەو مواسەفاتانە، ئەم ئەخلاقانە، هێزو قووەتن بۆ ڕووحمان، هێزو قووەتن لە بۆ گیانمان، لە بۆ شەخسیەتمان وەی لێدەکاتن کە بەڕاستی ئەو شەیتانە لەبەرمان چۆك دابینیتن، حەتا ئەوەتان بیستیە چەند جارێك لە موحازەرەکاندا باسم کردووە،"محمدی کوڕی واسیع" کە یەك لە پیاوە ساڵیحەکانەو زۆر عالیمیشی بووە، دەفەرمووێ: دوعایەکم دەکرد

هەموو جارێ لۆخۆم، گوتی: شەیتان ڕۆژێك یەخەی گرتم، گوتی: "محمد" دەمناسی.؟ گوتم: ناوەڵلا.. گوتی: ئەمن شەیتانم.! گوتی: زۆرم پێ سەیر بوو.! شەیتان خۆی بەمن پیشان دا.

بزانن شەیتان گەورەی جنەکانە چونکە زۆر لە مامۆستایانی بە ڕێزمان، زۆر لە خەڵکی وە دەزانن شەیتان یەك لە مەلائیکەتەکانە، نەخێر،، شەیتان " وكان من الجن ففسق عن أمري ربه" خوای گەورە بۆ خۆی دەفەرمووی:"وكان من الجن" لە جنە.. شەیتانیش بۆ خۆی لە ئایەتێکی قورئانی دا، گلەیەکەی لە خوای گەورە دەکاتن، عیتاب دەگری لە ئیشی خوای گەورە، دەڵێتن:" خلقتني من نار وخلقته من طين" ئەمنت لە ئاگر دروست کردووە ئەویش لە قوڕت دروست کردیە، بە ئیتیفاقی هەموو زانایانیش مەلائیکەت لە ئاگر دروست نەکراون، مەلائیکەت لە نور دروست کراون، کەواتە بە خۆی دەڵێ: من لە ئاگرم، جنیش لە ئاگرن، کەواتە ئەوە دوو دەلیل سێ یەمیشی کە شەیتان جنە، خوای گەورە وەسفی مەلائیکەتەکان دەکا دەفەرمووێ: ﴿لا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ التحريم:٦ "لا يعصون الله ما أمرهم" هەرگیز بێ ئەمری خوای گەورە ناکەن، "ويفعلون ما يؤمرون" خوای گەورە هەر چییەکیان پێ بڵێ، جێ بەجێ دەکەن، مادام شەیتان بێ ئەمری خودای کرد مەلائیکەت نییە، دەی کەواتە ئەم شەیتانە، ئەم مەلعونە، بە هەموو نەوعێك دەیەوێ ئێمە هەر بخەڵەتێنێ.

جا شکلی خۆی دەگۆری بە ئەنواع ئەشکال وەکو باقی جنەکانی تـر، خوای گەورە قودرەتەکی دایتە ئەو جنانـە، (سـبحان الله) شـکلی خۆیـان ئەگۆرن، جا ئەوانەی لە شەیتانی زۆر نزیکن، ئەو مەعلوماتەی ئیـستفادە لێدەکەن، کەمێك "محمدی کوری واسیع" بە جـێ دێڵـین، شـەیتان پـاش دیراسە کردنو فکرکردنەوەیەکی زۆری ئەوانەی خەریکی ئەو لێکۆلینەوەن، قەناعەتیان هاتییە کە عەرشی شەیتانی پێدەچی (الله أعلم) لە "دورگەی بەرمۆدایە" لەناو جەزیرەی برمۆدایە، مەعلومی جەنابتانە کە زۆر شـتی عەجانبو سەرسورهێنەری لێ روو ئەدا، ئەوانەی زۆر لەشـەیتان نیـزیکن پێی دەڵێن "عیفریت" عیفریتیش.. سەد هەزار ملیۆن جنی لەبن دەستە، واتە ئەوە بەپلەیە، جا ئەو شەیتانانەو جن دەبنە دوو قسم، ئەوەی کافر بی لەگەڵ شەیتانی ئیش دەکا، ئەوەی موسڵمان بی. لەگـەڵ شـەیتانی ئـیش ناکات، هەتا لۆ مەعلوماتی جەنابتان ئەوە ئیـستفادە لێدەکـەن، ئەگـەر سورەتی" البروج" بخوێنی، فوو بکەی ئەوە بە قەدەر فووەکانی تـوو جنـە کافرەکان دەسوتێنی، بەلاّم ئەگەر موسڵمان بی ناسووتێ هیچی لێ نـایێ، جا بزانە خوای گەورە قابیلیەتێکی عەجانیبی دایتە ئەو جنانـە، دەتـوانن بەهەموو شێوەیەك خۆ بگۆرنو خۆ ئەشکالو ئـەلوان بکـەن، بـێ گومـان لەسەر شێوەی حەقیقی خۆیان ئێمە نایان بینین، خوای گـەورە لـە نەفـسی نایەتدا ئەفەرموویێ: ئێوە نایان بینن.. ئێمە قەد نـاتوانین ئـەوان ببیـنن، بەلاّم ئەوان ئێمە دەبینن، لە قیامەتێ پێچەوانە دەبێتەوە.

بەو شکلەی خوای گەورە دروستی کردووە، بەڵام ئەگەر خۆیان لە بۆ جسمی دیکە گۆڕی، لە بۆ ئەشکالی دیکە،ئینسان ئیمکانییەتی هەیە، جا ئەو "محمدی کوڕی واسیع"ە دوعایەکی دەکرد، ئەو شەیتانی مەلعونە هات گوتی: ئەی محمد ئەو دوعایەی مەکە چت دەوێ دەمێ، هەرچت دەوێ لە دونیایێ هەرچت پێویستە ئەمن بۆت حازر دەکەم، بەس تۆ ئەو دوعایەی مەکە، گوتی! چ پەیوەندی بەتۆ هەیە؟ گوتی: لەبەرئەوەی من " شەیتان"م بەو دوعایەی زۆر ئەزیەت دەخۆم، گوتی: بە لەعنەت بیی، ئەم دوعایە بکەم هی دەبی هەموو کەسەکی فێرکەم، بزانە ئەمەباین دەمانگوت: ئۆی لە خوای بەزیاد بی، کوڕە ئەوەم دەوێ، ئەوەم دەوێ، دەی کوڕە ئەو دوعایە چییە.؟ سەد دوعای تر دەکەم، ئەوا سەرکەوتنە لەشەڕ، بزانە شەیتان بە چ ئەوعەکی هاتییە لە بۆی دەیەوێ بیخەڵەتێنیتن، جا ئەو مواسەفاتانەی کە ئەیلێین: ئەو ئەخلاقاتانەی کە ئێستا باسی دەکەین بەڕاستی شەیتانی زۆر غەمگین، ئەوەی کە ئێستا دەڵێم: توورە بوون خواردنەوە، یەك لەو سیفەتانە. تورە بوون خواردنەوەیە "سبحان الله" ئەسڵی توورە بوون لە شەیتانەوەیە ئینسان کە توورە دەبی شەیتان وەی لێدەکا کە توورە بی.

ئیمامی غەزاڵی دەفەرمووێ: توورە بوون ئاگرەکە لەناو مێشك، بزانە دەفەرمووێ: ئاگرەکە لەناو دەماغی ئەم ئینسانەی دەبتەوە، دەفەرمووێ: نابینی هەردوو چاوانی سۆر دەبێتەوە، جا چەند ئەو ئاگرە بەهێزتربیتن،

بەقووەت تر بیتن شەیتان پفی دەدا (سبحان الله) پفی لەو ئاگرەی دەداوەدەکا ئەو کابرایە زیاتر تووڕە بێت، جا دەکەوتە سەر زمانی، دەکەوتە سەر دەستی، دەکەوتە سەر پێی، جا پیاو هەیە تووڕە دەبی ئەوەی شت هەیە لە ماڵێ بەسەرو گوێلاکی هاوسەرەکەیدا دەدات، یان ئەوەیە دیتیتم پیاو هەیە تووڕە بووە، تاو دەداتە شووشەوات هەموو شووشەواتی ماڵێ دەشکێنی، بزانە. ئەوە ئاگرەکەیە دێتە خوارێ، پیاوی وا هەیە کاتێك تووڕە دەبی سەری خۆی لە دیواری دەدا، (سبحان الله) چونکە ئا لێرە ئینسان سەیتەرە دەکا، ئەو سەیتەرەیە لە دەستی، کە سەیتەرەی لە دەست دا، جا هەموو فعلێکی خراپی پێ دەکا، ئەم تووڕەییە بە چ دەڕوا، ئەو تووڕەییە لە شەیتانە، بە چ دەڕوا؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێ: ئەگەر یەکێکتان تووڕە بوو دانیشی، ئەگەر هەستا بوویەوە بڕۆ دەست نوێژێك بشۆ، دیارە بەم دەست نوێژەو دانیشتنە ئاگرەکە کپ دەبتەوەو شەیتانیش بە دەست نوێژ شوشتن لێت دوور دەکەوێتەوە، یەك لەو ئەخلاقە جوانانەی کە بەڕاستی ئەهلی ئەوانەیە کە بەڕاستی تووڕە بوونی خۆیان دەخۆنەوە، خەڵکیش ئەوانەی تووڕە دەبن چوار جۆرن:

١-هەیە زوو تووڕە دەبێ زوو سارد دەبێتەوە، ٢-هەیە زوو تووڕە دەبێ درەنگ سارد دەبێتەوە، ٣-هەیە درەنگ تووڕە دەبێ درەنگ سارد دەبێتەوە، ٤- هەیە درەنگ توورە دەبێ زوو سارد دەبێتەوە، پێغەمبەری

خوا(ﷺ) دەفەرمووێ: باشترینیان ئەو کەسەیە درەنگ تووڕە بێ زوو سارد بێتەوە، خراپترینیان ئەو کەسەیە کە زوو تووڕە بێ درەنگ سارد بێتەوە، بزانە تەماشا ئەتوو خۆت قیاس کە بزانە تۆ لە باشەکەی، یان لە خراپەکەی، یان لە ئەوەی ناوەندێی، جا بەڕاستی ئینسان زۆر کەم تووڕە بێ، یەعنی باشترین کەس ئەوەیە درەنگ تووڕە بێ، زۆر زۆر درەنگ تووڕە بێ، بەڵام زۆر زوو سارد بێتەوە، خراپترینیش ئەوەیە، زوو تووڕە بێ بەڵام درەنگ سارد بێتەوە، جا ئینسان دەبێ بزانێ تووڕە بوون لە شەیتانیەوەیە، شەیتان لەکاتی تووڕە بووندا دەتوانێ گەورەترین کارەساتت بۆ دروست بکا، کاکە زەلام هەبووە لە تووڕە بوون ژنی خۆی تەڵاق داوە، زەلام هەبووە لە تووڕە بووندا گەورە ترین ناماقوڵی کردووە، لە دایکی خۆی داوە! کوفری کردووە، بێ ئەمری خوای گەورەی کردووە، سەد قسەی نا بەجێ ی کردووە، ئەوە هەموو شەیتانە زەفەرت پێ دەبا، "إنفیعالت" پێ دەکاتن، جا بەڕاستی تووڕە بوون خواردنەوە، کوڕە زۆر گەورەیە، شتەکی زۆر گەورەیە، خوای گەورە ئەوەی بە سیفەتێك باس کردووە، لە قورئان کە دەفەرموێتن: ﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ ال عمران: (134) تەماشاکە بەڕاستی ئەو ئایەتە زۆر "عظیم"ە کە خوای گەورە سێ سیفەتی ئەهلی ئیمان باس دەکات.

ئەهلی موسڵمان، پیاوی ئیماندار باس دەکا، دەفەرمووێ: ئەو

كەسانەی ماڵی خۆیان دەبەخشن "في السراء والضراء" لە ناخۆشـی‌و لـە خۆشی دا ئەوانە ماڵی خۆیان دەبەخشن، چـونكە عـادەت وایـە ئینـسان دەتوانی ماڵی خۆی ببەخشێ، بەڵام پیاو ئەو پیاوەیـە كـە نـەیبی مـاڵی ببەخشی، كە ئەشت بـی ئـەوجا"ویـؤثرون علـی أنفـسهم ولـو كـان بهـم خصاصه" ئەوە سیفەتێكی دیكەیە كە إنـشاالله باسـی دەكـەین، كەواتـە ئەگەر بوو لە هەموو حاڵەتێك دا لـە هـەبوون‌و نـەبوون توانیـت شـتەكی ببەخشی بەڕاستی شتێكی گەورەیە، "والكـاظمین الغـیظ" خـوای گـەورە دەفـەرمووی: ئەوانـەی تـووڕە بـوونی خـۆ یـان دەخۆنـەوە، تـووڕە بـوون خواردنەوە، شتێكی ئەوەندە ئاسان نییە، كردارێكـی ئەوەنـدە سـانا نییـە بڵێی ئەوە ئاوەكم خواردەوە، بەڕاستی پێویستی بـە شـەحنەیەكی ئیمـانی زۆر هەیە، پێویستی بە خۆ لێڕاهاتن‌و راهێنانی زۆر هەیە تاكو بەڕاسـتی تـۆ بتـوانی تـووڕە بـوونی خـۆت بخویتـەوە، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەفەرمووێ: ئازاو بە غیرەت ئەو كەسە نییە لە شەڕێ پشتی یەكێكی بـە عاردی دادا، بەڵكو ئازاو بە غیرەت ئەو كەسەیە كـەوا لـە كـاتی تـووڕە بووندا، تووڕە بوونی خۆی خواتەوە، ئەوە زۆر "عظیم"ە ئازیزانم، بەڕاستی دەبی ئێمە ئەو ئەخلاقە بهێنینـەجێ، خاسـەتەن ئەوانـەی هـەڵگری ئـەم دینەن، ئەوانەی غەم خۆری ئەم دینەن، ئەوانەی كە دڵسۆزی ئـەم دینـەن، بەڕاستی دەبی سیفەتی تووڕە بوونیـان تێـدا زۆر زۆر كـەم بـیتن، چـونكە ئەگەر تۆ تووڕە بی كەڵكت نابی، ئەگـەر قـسەكت لەگـەڵ بكـرێ دەبتـە

شەڕی جیهانی!، ئەدی من شکەیاتی دڵی خۆم لە کن کێ بکەم ئەدی مەشاکیلی خۆم لە کن کێ حەل بکەم، ئەگەر ئەتوو کەڵکی ئەوەت نەبێ دوو قسەت لەگەڵ بکەم، یەکسەر قسەی نابەجێ بکەی.

جا بەڕاستی دەبێ ئێوەی بەڕێز تازە بیدایەتی عومرتانە، بەڕاستی تازە عومری ئێوە دەست پێ دەکا، ململانێ دەست پێ دەکا، تازە تێکەڵاوی ژیان دەبن، ئیتر کە ئینسان لە کولیەی تەواو بوو ئەوجا بەڕاستی لەناو ژیاندا تێکەڵاو دەبێ، بە سایەی ژن هێنان، بە سایەی شوکردن، بەناو عالەمی خاریجی، بە سایەی تەعین بوون، بە سایەی دەرس گوتنەوە، بەسایەی دامەزراندن لە دەوائیرەکان دا، لەگەڵ خەڵك، لەگەڵ تەبیعاتان، لەگەڵ جۆرەها ئەخلاق و مەشاعیر تێکەڵاو دەبێ، ئەوانە شەرت نییە هەمووی لە دڵ و لە دەروونی تۆ بچەقیتن، لەوانەیە زۆریان عەکس بێتەوە، لێرە بەڕاستی زۆرت پێویست بەوەیە کە تووڕە بوونی خۆت بخۆیەوە، ئینفیعال نەکەی، زۆر لەسەرەخۆبی، جارێکیان کابرایەکی خەڵکی دەشتێ، عادەتەن (أعرابی) خەڵکی بیابان لای مەککەی زۆر زۆر زەلامی هیشك و بریشك و بێ تەبیعەتن، هەر تەبیعەتیان وابووە، ئێستا لە میسر (صعیدی) هەنە، سەعیدیەکانی میسر (سبحان الله) زۆر زۆر تەبیعەتیان توندە، ناوێرین باسی خۆشناوی خۆمان بکەین کاکە! هەر باسی سەعیدیەکانی میسر دەکەین، جا هەندێ کەس خوای گەورە وای دروست کردووە، ئەوانەی لای دەشتێ مەسەلەن ئی لای مەککەی

دەشـــتەکیەکانی مەککـــەی، دەشـــتەکیەکانی لای مەدینـــەی زۆر زۆر تەبیعەتیان هیشك بووە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر حوشترەکەی خـۆی سوار ببوو دەیویست بڕواتن، کابرایەکی ئەعرابی هات بە بێ ئەوەی بڵێ یا رسول الله بە جوانی، پێغەمبەری خواش عەبایەکی لەبەر کردبوو، لەوانەیە ئەوکات کراسیشی پشت ملی نەبووە؟

هەر ڕاست کراس بووە، بە بێ پشت مل بووە کەوەختی خۆی لەبەریان کردیە، تازە ئەو مۆدیلاتو ئەو شـتانە دەرچـووە، جـا ئـەو عەبایەکـەی لەسەر ملی دانابوو عەبایەکەشی مەرەز بوو، لـە مـووی بـزنو حوشـتری دروسـت دەکـرا، زۆر دڕە، یەکـسەر ئـەوها نییـە لـە خـوارەوە لـچکی عەبایەکەی ڕاکێشا، ئەو عەبایەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) گوتی: یا (محمد) بمدێ ئەوەی خوای گـەورە دایتیـە تـوو، دە وەڵـلا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ئاوڕەکی داوە یەك زەردەخەنەی پێکەنینی کرد، فەرمووی: بڕۆن چی دەوێ بیدەنێ، ئێمە باینە وەڵلاهی سەد زللەمان لێدەدا، بـەخوای هیچیـشمان نەدەدایێ، ئەوە زۆر "عظیم"ە کە ئەتوو بتوانی دەمو دەست تووڕە بوونی خۆت بخۆیەوە، ئەعرابیەك ئەو جارە کابرایەکی خەڵکی دەشـتێ هـات بـۆ شاری مەدینە، دیتی هـاوەڵان دانیـشتینە" الـسلام علـیکم" "وعلیـك السلام" چوو لە جێی نوێژێ میزی کرد، سبحان الله، وەڵلا هاوەڵان هـاتن چاویان ئەوەندەی لێهات، ویستیان لـۆی بـچن، یەکـسەر پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمووی: نەء لێی گەڕێن (سبحان الله) ئەوە مەسـەلەیەکی عیلمـی زۆر

دەقیقیشی تێدایە نا نەوە، یەعنی ئەو مەسەلەی "لا حیاء في الطلب الدين" ئینسان لەو وەختی کە میز دەکا نابیی تەنگاوی بکەی، چونکە یەکسەر تووشی نەخۆشی ئیلتیهاباتی مشانەی دەبی نابی تەنگاوی بکەی، چونکە بە ئەمری ئەو خوایەی حاڵەتێکی نەفسی لۆ دروست دەبی قەتع دەبی، جارەکی بە بیرم دێ ئێمە گیرایین لە بەغدایێ، لە سەیتەرەی ئەمانزانی مەسەلە چیە، تەلەبە بووم دەهاتمەوە، لە ساڵی -١٩٩١- لە پاشی ئینتیفازەی لە بەغدایێ دەهاتینەوە لە سەیتەرەی یەکسەر رایانگرتین گوتی: ئەوەی عەرەبە بێتە خوارێ، ئەمنیش گوتم: ئەو قوربەسەرانە تەماشا وازیشیان لێ ناهێنن، هەموو بەعسیەکانیشمان دەرکرد، ئەوجا بە کەیفی خۆمان هاتوچۆ دەکەین، بەپێچەوانەوە، یەکسەر گوتیە شوفێری پاسەکە بگەرێوە، ئەژدەك لە پێشمە رۆیی ئەمەیان بردە مدیریەتی ئەمنی عامە، کە زانیمان مدیریەتی ئەمنی عامەیە، ئەو وەختی "سبحان الله" هەر نەفسییەن ئەتوو تەنگاو دەبی، ئەوجا لەگەڵ تەنگاوی خۆشمان "سبحان الله" چەند جار داوامان دەکرد کە دەچووینە پێشاوێ هیچ نەبوو.

ئەوە حاڵەتێکی نەفسییە، لە ترس و لە حاڵەتێکی هاوشێوە لێت دروست دەبی، جا ئەو ئەعرابیە کە هات دانیشت پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر ئەو نەیگوتبایە هاوەڵەکان کورە مەچوون، بە قورئان لێیان دەدا یەکسەر فەرمووی: لێی گەرێن، وەڵڵا کابرا بە ئیسرحاتی خۆی ئەوجا

دەستی لە ملی کرد فەرمووی : "یاأخا العرب" برای عەرەب گیان ، ئێرە جیّ ی عیبادەتە، ئێرە جیّ ی خوا پەرستیونوێژە، ئێرە "لم یبنی المساجد للقاذورات" ئەوە خۆ بینا نەکرایە ئەتوو ئەو ئیشەی لە ناو بکەی، ئێرە جیّ ی سوژدەو نوێژە، ئەوجا ئەعرابیەکە زۆر مەمنونی پێغەمبەری بوو(ﷺ) گوتی: دە یارەبی خوایە ڕەحم بە منو بەمحمدی بکەی، لۆ.. لەبەرئەوەی ئەوانە چاویان لیّ سوور کردبۆوە، گوتی: با ئەوانە بەشداریمان نەکەن، بەس دوعایەکە لۆمنو محمدی بی،-علیە الصلاة والسلام- دەیفەرموو: یا أخا العرب لا تضیق واسیعا" ڕەحمەتێکی گەورە بچووك مەکەوە، جا سبحان الله پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: دە بڕۆن دۆلکە ئاوێکی بینن بەسەر میزەکەی دا بکەن، ئەو عەردەش قومە بەخۆی دەمژیو خاوێن دەبیتەوە.

ئەوە تووڕە بوون خواردنەوەیە، ئەوە زۆر "عظیم"ە بتوانی لە ڕووداوێك کە لە دەمارت دەداتن، یەکسەر بێی تووڕە بوونەکەی خۆت بخۆیتەوە، جا بەڕاستی ئینسانی داعی ئینسانی بانگخواز، ئەو مرۆڤانەی کە بەڕاستی غەم خۆری دینن ئەم حالەتەیان زۆر تووش دەبی، حالەتەن قسەی ناخۆشی پیّ دەلێن، یەك تووڕەت دەکا، یەك قسەکی وات پیّ دەلیّ، بە "عبداللەی کوڕی المبارك" یان گوت: ئەو پیاوە نازدارە بەخوای پیاوێکی ریاض بوو، گوتی: وەلّلاهی ئافەرین کو ناسیم، کوڕە ئەمەباین دونیامان خرادەکرد، "سالم کوری عبداللەی کوڕی إیمامی عومەر"

عبداللەی کوڕی إیمامی عومەر مەشورە کوڕەکی هەبوو ناوی "سالم" بوو لە مینایێ کە دەچی شەیتانی ڕەجم دەکەی زۆر قەرەباڵغە یەك نییە نەیزانی پێی لە پێی کابرایەکی نا، کاکە ئەو کابرایە ئەوا چاوی لە "سالم"ی سوور کردەوە، گوتی: دەزانی ئەتوو پیاوێکی زۆر خراپی.؟ گوتی: وەڵلاهی ئەتوو ڕاست دەکەی.! تەماشاکە. ئینسان ناکا بڵێ ئەمن خراپ نیمەو ئەوها ئەوهاو ببتە گێرو گرفت.

گوتی: وەڵلاهی ڕاست دەکەی، بزانە ئەوە زۆر "عظیم"ە کابراکە بەرامبەرت کە ئینفیعال دەکا، ئەتوو بتوانی ئینفیعالی ئەویش قووت بدەیەوە، "عومەری کوڕی عبدالعزیز" –ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ- بەیانی چووبووە مزگەوتێ ئێ بەیانی زوو تاریکە هێشتا، وەکو ئێستا نییە گڵۆپو چرا هەبیتن، کابرا نوستبوو "ئیمامی عومەری کوڕی عبدالعزیز" ڕاست پێی لێنا پێی لە ملی نا نەیزانی.! یەکێکی لە دوا دەڕوا، یەکسەر کابرا لێی تووڕە بوو، أستغفرالله گوتی: کەری؟ گوتی: نا.! وەڵلا کابرای عیمایە تووڕە بوو گوتی: یا ئیمام لێم گەڕێ با تەمبێیکەم. کو بە خەلیفەی موسڵمانان دەڵێی: کەر، گوتی: نەء. وای نەگوت: گوتی: ئەدی، گوتی: پرسیارێکی کرد، ئەمن جوابی پرسیارەکەم داوە، وەڵلاهی ئەوە دڵێکی زۆر فراوانی دەوێ، جا بەڕاستی ئەو خورەوشتە، یەعنی خواردنەوەی تووڕە بوون، بەڕاستی شتێکی زۆر"عظیم"ە پێغەمبەری خوا-علیه صلاة وسلام- دەفەرمووی: "أنا زعیم ببیت في وسط الجنة"

ئەمن زەمانەت دەدەم بۆ کەسێك، بەخانووێك لە ناوەندی بەهەشتیٚ، بـۆ کیٚ؟ بۆ کەسێك ئەگەر توورە بوو، توورە بوونەکەی خۆی بخواتەوە "سبحان الله" چەند جاری ئـەتوو تـوورە بـوونی خـۆت بخۆیتـەوە، ئـەوە خانوێـك وەردەگری لـەناو بەهەشـتیٚ، ئـەوە دیـارە عەمەلیەتێکـە پێویـستی بـە موجاهەدەو پێویستی بە توندیـەکی زۆر هەیـە، خـاڵێکی تـر کـە بـاس بکـەین، لـەو ئەخلاقانـە تەبعـەن ئەوانـە هەریـەکی یـەك وانـەی دەویٚ، دەمانەویٚ، بەخێرایی بەڵکو پێرابگەین ئەو باسەی تەواو بکەین، إنـشاالله خاڵێکی تریش ئەوەیە.

ئەو ئینسانەی کە سەرکەوتووە بەرامبەر نـەفسو ئـارەزوو شـەیتان، پیاوێکی لەسەرەخۆیە ئافرەتێکی هادینە، یەعنی زۆر زۆر صـبورە، نـەك سابیرە" صبورە، بە صیغەی موبالەغە یەعنی زۆر زۆر زۆر بە سەبرە، جـا بەراستی ئەوەی بە سەبر بـیٚ هـەرگیز هەڵـە ناکـا والله، ئەوانـەی زیـاتر مەشاکیلیان تووش دەبی، ئەوانەی تووشـی قیڕوقـاڕو مەحکەمـەو بینـەو بەردە دەبن، هەمووی لە بیٚ سەبریە، وەڵلەهی دەقەیـەك سـەبر عومرێـك پێی ئیسرحات دەکەی، یەك دەقە سەبر بەرامبەر بـە موشـکیلەیەك یـەك عومر بۆ تۆ دەگەڕێتەوە بە خۆشیو شادی، سـەبر نـەگرتنی یـەك دەقـە، بۆتە مایەی ئەوەی هەتا عومرت مایە بەسەر، شۆریو بە زەلیلـی بـژیت، ئینسان دەبی زۆر بە سەبرو لە سەرە خۆبی لـە هـەموو موسـیبەتەکاندا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێ: "الصبر نصف الإیمان" سبحان الله ئـەو

ئیمانە "عظیم"ە نیوەی سەبرە، هەروەها دەفەرمووێ: الـصبر مـن إلایـمان کمنزلة الرأس من الجسد" قەدرو ڕێزی گەورەیی سەبر لەناو ئیمانـدار، بـە قەدرو ڕێزی سەرە لە ناو لاشەدا، ئێستا ئەگەر ئەو لاشەمان سـەری پێـوە نەبێ، ئەو لاشە چ لێبکەم! هیچ، ئەسڵەن ئیسیفادەکی نییە، هەر لـۆ وەی باشە بچی لە قەبرستانێ بیشاریەوە، بەڵام ئەگەر سەری پێوە بـوو، بزانـە چی لێ دروست دەبی، مەنفەعـەت ئیـستیفادە، ئـاوەدانی، ئامۆژگـاری، کاری باش‌و وەنیە. ؟سەعادەت کامـەرانی، هـەموو شـتێکی لێ دروسـت دەبی، ئەما ئەگەر سەری پێوە نەبوو، هیچ ئیستیفادەی نـابی کەواتـە... ئەسڵی بەرەکـەتی لەشـەکە لەسـەر دایـە، ئەسڵی بەرەکـەتی ئیمـانیش سەلامەتی ئیمانیش، رێك‌وپێکی ئیمانی لە سەبردایە ،جا بەراستی سـەبر زۆر"عظیم"ە. با ئەم قسەشتان بـۆ بگێرمـەوە ئیـستیفادە لـێ دەکـەن، کتێبێك هەیە ناوی "عدالة السماء" زۆرکتێبێکی خۆشە، نزیکەی یـانزە چیرۆکە"محمود شیت ختاب" هەزار رەحمەتی خوای لێبی "قەبری پـڕ نـورو بەرەکەت بکەی، ئەو پیاوە وەختی خۆی لیوایەکی گـەورەبوو لـە جەیـشی عیراقی، ئەوە حادیسەکی زۆر سەیر دەگێڕێتەوە، یەعنی ئەو حادیـسە زۆر پێم خۆشە ئیستیفادەی لێ بکەن، زۆرحالەت هەیە لە کوردەواری خۆمان، بەڕاستی سەبر نەگرتنمان، لە حالەتێکدا، کـە زۆرشـتەکە پـاك‌و بێگـەرد بووە، کە لە بێ سەبری ئێمە بوویتە حەیا چوون‌و گەورە بـوون وەمەشـاکیل دروست بوون، بزان تەماشاکەن ..ئـەو پیـاوە سـالیحە دەفـەرمووێت: دوو

جیران دەبن، زۆر تەباو ڕێکوپێك دەبن، پێکەوە دەچنە بازاڕی ئافرەتەکان، لە بازاڕیش عادەتەن"سوق البنات" هەیە لە بەغدایێ نازانم دیتیتتان یان نا . بازاڕی ژنانە، هەموو قوماش‌و پێلاوی ژنان دەفرۆشن، ئێستا کاول بووە هیچی تێدا نەمایە، مامۆستا مەجید هەزار ڕەحمەت‌و بەرەکەت برژێ بەسەر گۆڕی دا.

مەلا مەجیدی مزگەوتی تەکیەی خالیدی لەوێ بوو، لەلای سوقبەناتی بوو، جا ئەو سوقبەناتانە هەر ژنی دەچیتێ، دوو ئافرەت جیرانن پێکەوە دەچن قوماشی بکڕن کوڕە گەنجێکیش ڕاوچییە! دەچی لەوێدا، وەکو ئەسواق سیروانی مە دەسوڕێ‌و دەگەڕێ لەوێندەر، ئەو دوو ئافرەتەی دەبینی قوماشی تەماشا دەکەن، دەچیتە تەنیشتیان ڕادەوەستی، ئوسلوبیان وایە ئەو ڕاوچییانە، دەڵێن ئەو قوماشەمان دەوێ‌و دەی کاکە لۆمان بینە خوارێ، دەکاتە چەند؟ کابرا دەڵێ عایدی منە.! ئافرەتەکە تەماشای دەکا کەربووە بێ عەقڵ بووە، عایدی توو لێیی وەربگرە، چەند دەکا؟ ئەوەندەیە.. تەواو، واڵلا پارەی لێ وەردەگرن‌و پستە پستەکی لەگەڵ یەك لەئافرەتەکان دەکاو تەواو، وەرە چۆن بووە بزانە حاڵەتی ئەو کوڕە، چۆن بووە، ئەو کوڕە بەخۆی عەسکەر دەبی، دووشەممان‌و جومعان دادەبەزی بەخۆی ماڵیان لە بەغدایێ بووە ئیشی وەی چییە.؟

بەس دووشەممان‌و جومعان خۆی سپۆرت دەکا لە (سوق البنات) دەسوڕێتەوە، تەقدیری خوای ئەو دوو ئافرەتە یەکەکیان ژن بووە، ئەوەی

قسەی لەگەڵ کردیە، ژن بووە کە قسەی لەگەڵ دەکا، وەدەزانی حەزی لێ دەکا، ئەوەندە بێ عاقڵە.. پارەکەی پێ دەدا، ژنەکەی جیرانیان دەڵێ ئەتوو کو هێشتت پارەکەی بدا، دەڵێ: لێی گەڕێ کەربووە، با پارەی بدا چییە فشەیە، کە پارەکەی پێدەدا ئەم کورە لەکۆڵیان نابێتەوە، هەر لەگەڵیان دەڕوا، هەر لەدوایان دەڕوا، قەدەری خوای گەورە هەتا دەگەنەوە ماڵێ، کە دەچنەوە ماڵێ و دەچنە ژوورێ یەك لەژنەکان پێی دەڵێ: حەفتەیەکی تر ئەو وەختانە ئینتیزارت دەکەم، نۆهـ کورە خەنی دەبی.

دەچێتەوە، ئەو حەفتە بەهەزار ساڵی یە هەتا دەڕوا، ڕۆژی پێنج شەمێ دادێ قاتەکی قەرد دەکا، بۆنی لەخۆی دەدا، دەچی لەدەرگای ماڵەکە بدا، دەبینی دەرگا کراوەتەوە، دەڵێ کورە دەرگەشی بۆ من کردیتەوە، دەچێتە ژوورێ بەبێ پرس، دەچێتە ژورێ ئافرەتەك بەکراسی ماڵێ لە ژوورەوە نوستوە، ڕووشی لەلای دیواریە، ئاهـ دەڵێ: بەقوربانی بم خۆشی حازرکردووە! (سبحان الله).. ئاوا دەیەوێ ئافرەتەکە هەڵبستێنێت، یەکسەر دەمانچەك لەسەر سەری دادەندرێت، ئاوڕدەداتەوە دەبینی زەلامەکە قافی سێڵی ئەوەندەیە، کابرا ڕاست دەوی تێك دەناڵێتن، دەشلەژێ قوڕگی دەگیرێ دەلەرزی، ئا لەم لەحزە سەبرگرتن یەك ملیۆن دیناری دینی، بلیمەر نا نەسلی، یەك ملیۆن دیناری دینی دەقەیەکی سەبر بگری، چونکە لێرەدا کەمترین هەڵە بکا کابرا ناموسی دەچی، وەنیە.؟ بابزانین ڕووداوەکە چی لێ دێ، کە دەمانچەکەی لەسەر سەری

دادەنێ، کابرا دەلەرزیو دەوی تێك دەئاڵێو لێویو وشك دەبێت، ئەو کابرایە زۆر عاقڵ دەبێت، هیچ خۆی تێك نادا، دەمانچەکەی هەڵدەگری، چونکە ئەو دەترسێ لێی، دەستی دەگریو دەیباتە ئەودیوی، هەر ژنەکەی هەڵناستێنی، دایدەنێو هەندێك ئاوی بۆ دێنی، ئاوەکەی دەخوا بڕەك دێتەوە سەرخۆ، دەڵێ کاکە یاخوا بەخێربێی سەر هەردوو چاوانم، دەڵێ: مەترسە هیچ نەبووە ئینسان دەبی لە ماڵی خۆی یەکی غەریب ببینی دەمانچە دەرهێنێت، بەس بزانم. جەنابت کێی؟ خێرە هاتیە ماڵی ئێمە!؟ ئەویش ئیعترافی هەمووی لۆ دەکا، دەڵێ: پێنج شەمەکەیدی لەبازاڕی بووم ئەو کچەی تۆم دیت، ئەو ئافرەتە ئەوهاو ئەوها، گوتی: باشە.. ئێستا بۆت بانگ دەکەم ئەگەر هەویوو بڵێ خۆیەتی، ئەو ئیشەی لەگەڵ کردم، وەڵلا بانگی دەکا دەڵێ: ئافرەت وەرە ئاومان بۆ بینە، کە ئاوی دەینێت، دەبینی ئەو ئافرەتە هەو نییە، ئەوی قسەی لەگەڵ کردیە، ئەو ئافرەتە بووە کە لەگەڵ ئەو ژنەی بووە ڕاوەستایە، بزانە تەماشاکە، هەر ئەوە ئاگای لە هیچ نەبووە.

ئەو بەستەزمانە، هەتا گۆتیتیە ژنەکەی دی لۆ وەت لێ کرد، گوتی: لێی گەڕێ لۆ خۆمان کەرمان کردیە، پارەمان پێ دایە، دوایێ ئافرەتەکە دەڵێ: قسەی ئەو پیاوە، پیاوەکەی پێی دەڵێ: قسەی ئەو کوڕە گەنجەی چییە؟ دەڵێ: وەڵلاهی ـ ئەو ئافرەتەی جیرانمان بوو ئەوهای لەو کوڕەی کرد، واڵلا: ئەو پارەکەی پێ داو گوتی: لێی گەڕێ ئەوە ئەوهامان

لێکردیەو ئەگەرنا ئەو کوڕە بەستەزمانە هیچ عەیبی نەبوو بەخۆمان ئەوهامان لێ کرد، کە ئەوجا پیاوەکە بۆی بەدیار دەکەوی کە ئەو رووداوە هیچ پەیوەندی بەژنەکەیەوە نییە، ژنەکەی لێی بەرییە، جا ئەتوو فکرکەوە بزانە. کابرا ئەگەر کوڕەکەی بکوشتبایە، دەبا ژنەکەشی بکوژی وەنیە؟ حەیاشی دەچوو، تووشی قەتڵیش دەبوو بەناحەق، لە مەحکەمەو لەناو خەڵکی دەیانگوت: کوڕە بابە ئەو ئافرەتەی فلانی بێ رەوشت بوو، بزانە کەواتە سەبرگرتن زۆر ((عظیم))ە بەڕاستی ئینسان دەبی لە هەموو حاڵەتێکدا، سەبری هەبی لەسەرەخۆبی، پێغەمبەری خوا ـ علیه الصلاة والسلام ـ لەگەڵ سەفیەی خێزانی دەڕۆیشت، تاریك بوو جێیەکە، هاوەڵێك لەدوو ڕا دیتی.

یەکسەر پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمووی: فلان: گوتی: بەڵێ یا رسول الله.. فەرمووی: ئەوە سەفیەی خێزانمە.! گوتی: بۆ یارسول الله. خۆ ئەمن گومان بەتۆ نابەم، فەرمووی: نەء. ئەوەکو شەیتان ئەلێرۆکانە زەفەرت پێ ببا، ئینسان دەبی سەبری هەبی، زۆرجاران لە تاریکی شت دیار نییە، بەلام کە هاتە ڕووناکی ئەوجا دەزانی ئەوە حەقە یان ناحەقە، جا ئینسان دەبی لە هەموو حاڵەتێکدا، خوشکانی بەڕێزم، برایانی عەزیزم، زۆر بەسەبر بن،ئینفیعال مەکەن لە شت، لە خەبەرهێنان پەلە مەکەن، ئینفیعال مەکەن،خێرا هەڵسوکەوت مەکەن، حوکمی بە زۆرەملێ مەدەن، زۆر لەسەرەخۆ بن، شتێکی زۆر عەنتیکەتان لێ

بگێڕمەوە، کابرایەك هاتە کن ئیمامی ئیبن یوسف کە یەك لە تەڵەبەکانی ئیمام ئەبو حەنیفەیە، کە پیاوێکی زۆر نازدارەو پیاوێکی زۆر زیرەکە، فەرمووی: ژنەکەم خیانەتم لەگەڵ دەکا، گوتی: چۆن خیانەتت لەگەڵ دەکا؟ گوتی: ( لاحیاء في طلب الدین) گوتی: ئەوەی دەیگێڕمەوە عاقڵم گەوردم، گوتی: ئەوەتا ئاوەکەیم لەسەر جێگای گرتییە، ئەوەتا لەسەر جێگای من، ئیمامی ئیبن یوسفیش دەڵێ: باشە جێیەکەم پێ پیشان بدە، دەیباتە ماڵێ تەماشا دەکاتن، ئاوا سەر بڵند دەکاتن دەبینی هێلانەی پەڕەسێلکەیان لەوێیە ((سبحان الله)) دیارە ئاوی پەڕەسێلکەی زۆر بەناوی ئینسان دەچێتن، یەکسەر گوتی: بابەگیان بەخوای ئافرەتەکەت لەگوڵ پاك ترە، بەڵکو ئەوە ئیی ئەو پەڕەسێلکانەیە، جا (سبحان الله) ئەگەر کابرایەکی بێ عەقڵ بوایە، ئیستیشارەی مامۆستایانی نەکردبایا، یەکسەر ژنەکەی خۆی دەدایە بەر گوللەو دەیگوت: ئەتوو خیانەتت لەگەڵ من کردووە، جا ئازیزانم زۆر لەسەرەخۆ بن، زۆر بە سەبر بن، لە هەر موشکیلەیەك کە دێتە پێشتان، لە هەر ڕووداوێك دێتە پێشتان، دەبێ ئینسان زۆر بەسەبرو بەتەحەموڵەوە لەگەڵ ئەو ئەحداس و ئەو ڕووداوانە تەحەموڵ بکاتن، سەبریش لە سێ حاڵەت لە هەموو شتەکی (عظیم) ترە

١ـ سەبر گرتن لەسەر طاعەتی خوای گەورە، زۆر عەزیەیە، کە تۆ نوێژ دەکەی ڕۆژی دەگری، شەونوێژ دەکەی زیکر دەکەی سەڵاوات لێدەدەی، هەر کارێکی ئیتاعەی خوای گەورەو پێغەمبەری خوا ئەنجام ئەدەی،

پێویستی بە سەبرە، تۆ بە سەبر دەتوانی نوێژەکت بە خشوعو بەملکەچی بکەی، تۆ نەتوانی بە سەبر دوانزە سەعات بەڕۆژی بی، ئەتوو دەتوانی بە سەبر دووسەد سەلاوات لێبدەی، دەتوانی سەعاتەك قورئان بخوێنی، ئەگەر سەبرت نەبی ئەوانەت هیچ پێ ناکرێتن، حالّی دووەم: سەبرگرتن لەسەر گوناه نەکردن بەڕاستی گوناه نەکردنیش سەبری دەوێ، غیرەتی دەوێ، هیممەتی دەوێ بتوانی ئەزەر نەکەیت، بتوانی تێکەلاوی ئافرەتان نەبی، ئافرەت تێکەلاوی پیاوان نەبی، دەتوانی چاوی خۆت بگری لە تەلەفزیۆنی، چاوی خۆت بگری لە شتی نارێك، حالەتی سێ یەم: سەبرگرتن لە بەلاو موسیبەتو غەمو پەژارەی دونیایێدا، بەڕاستی ئینسان لە حالەتێك هەر غەمو پەژارەو موسیبەتێك بەلایەکی دێتە سەرێ، بە سەبر بیتێ، بزانیتێ ئەمە خەلاتی خوایە، خوای گەورە تاقی دەکاتەوە، کە پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ دەفەرمووێ((عجب أمر المؤمن، ان امره کله له خیر) دەفەرمووێ: عەجائیب لۆ ئەمری موسلّمانێ هەمووی هەر خێرە، ئەگەر تووشی موسیبەتەکی بوو سەبر دەگرێ، ئەوە خێرە.. ئەگەر تووشی نیعمەتەکیش بوو شوکرانەی دەکا ئەمەش هەر خێرە، دەی کەواتە هەموو ژیانی ئێمە نیوەی شوکرە نیوەی سەبرە، بۆ..؟ یان لە خۆشی یان دلّ تووندی، وەنیە؟ یان لە پێکەنینی یان لە گریانی، لەو دوو حالەتە بەدەر نییە، لەگریان بووی یەکسەر سەبر بگرە.

ئەگەر لە پێکەنینیش بووی، یەکسەر حەمدو سەناو سوپاسی خوای



(رب العالمین) بکە، جا بەڕاستی سەبر گرتن، بڕبڕەی پشتی ئینسانی موسڵمانە، بەڕاستی ئەوەی سەبری نەبێ، خێرێکی زۆر (عظیم)ی لەدەست چووە، ئەوەی سەبری نەبێ کەڵکی هیچ ئیشەکی نییە پێی بسپێری، کەڵکی هیچ وەزیفەیەکی نییە پێی بسپێری، هەتا وەزیفەی دەعوە، ئەمانەتێکی لە لادانێی، وەزیفەی کە قورئان بە چەند کەسەکی بڵێ، هەر وەزیفەیەکی بدەیتێ، هەر واجبێکی بدەیتێ، ئەگەر سەبری نەبوو هیچ ئیستیفادەیەکی نابی، مامۆستا لە مەکتەبێ دەبی زۆر بە سەبربی لەگەڵ قوتابی، زۆر بە خولق بی لەگەڵ خوێندکار، تەڵەبە هەیە بێ عەقڵە، وەیە یان نا..؟ خۆنابی مامۆستا خۆی بینتە موستەوای عەقڵی تەڵەبەکەی، دەبی زۆر لە تەڵەبەکەی گەورەتربی، ئەمن مامۆستای وام دیتیە لەگەڵ تەڵەبەی بەشەڕ هاتووە یەکتریان دایتە بەر بۆ کسان، کوا وەزن کوا قیمەت، کوا ریزی ئەو مامۆستایەی ئێمە لەگەڵ تەڵەبان یەکتری بدەنە بەر بۆکسان، ئەسڵەن تەڵەبە هەر عورمەتی ناگری، دەبی بە ویقاڕ بی لەسەرەخۆ بی، بە هەیبەت بی، بە سەبرو بە تەحامولّ بی، ئێمە لەزانکۆدا ئەودکتۆر عارضەی ئێستا کە ڕەئیسی هەیئەی موسلیمینە بەقورئان مامۆستامان بوو، تەڵەبە نەبوو شەرمی لێنەکا، بەس لە ویقاڕی خۆی ئەوەندە بە سەبر، ئەوەندە بە تەحامولّ، ئەوەندە بە ویقاڕ (سبحان الله).

ویقاڕی ئینسانی شەخصیەتی ئینسانی نیوەی سەبرە با پێتان بڵێم، بە سەبر ویقاڕ دروست دەبی.

بە سەبرو گرانیو سەنگینی هەیبەت دروست دەبێ، بە پەلە پەل کردن هیچ دروست نابێ، لۆیێ دەڵێ: (ئیشی بەپەلە پەڵی ساحێبەکەی دەشەڵی)، بابەتەکە تەواو دەکەین ئینجا کۆتایی پێ دێنین چونکە وەختەکە ئاوا دەخوازێ، خاڵێکی دیش ئەوەیە ئەمر بەچاکەو نەهی لە خراپە، وەزیفەی هەموو موسڵمانێکە کە خۆی بە شوێن کەوتووی محمد المصطفی (علیه الصلاة والسلام) بزانێ، لەبەرئەوەی خێری ئێمە، چاکەی ئێمە، گەورەیی ئێمە بەو وەزیفەیە، خوای گەورە دەفەرمووێ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ لەبەرچی..؟ ﴿تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾ یەعنی خێری ئێمە بەو سێ سیفەتە دەبێ، ئەگەر بێتو ئەو سێ سیفەتەمان تێدا نەبێ، ئەوە خێرەکەمان لە قیس چوو، جا هەر ئومەتێك ئەگەر بیەوێ ئەو خێرو ئەو گەورەییەو ئەو فەزڵەی بگەڕێتەوە، هەر شەخسێکی دەیەوێ ئەو قەدرو ڕێزو حورمەتەی هەبێ لە لای خوای گەورە دەبێ ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە بکات، لە هەموو کەسەکی زیاتر ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە بەخۆتی، سەرەتا ئەمر بە چاکە دەکەی لۆ خۆت و نەهیش لە خراپە دەکەی لۆ خۆت، چونکە ئەوە (وابدأ بنفسك) پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ دەفەرمووێ: سەرەتا لەخۆت دەست پێکا، (ثم بمن تعول) ئەوانەی کە لە بن دەستتن، ئەوانەی کە نەفەقەیان لەبەردەستی تووە، ئەوانەی کەنزیکەکانی توونە، جا بەڕاستی دەبێ ئەوەڵجاری تۆ ئەمرو نەهی نەفسی خۆت بی، ئەو شتانەی

خراپە نەی کەی، ئەو شتانەی باشە بیکەی، ئەنجامی دەی، پاشانیش تینجا دەست پێ بکەی لەگەڵ خەڵکی، ئەمر بەچاکە بکەی لە خەڵکی، نەهیش لە خراپە بکەی لەگەڵ خەڵکی، شەرت نییە ئەوەی ئەمر بەچاکە دەکاو نەهی لە خراپە دەکا، ئیلا مەلابی، یان شێخ بی یان سەیدبی نەخێر. هەموومان لەسەرمان واجبە نەهی بکەین لە خراپەو ئەمر بکەین بەچاکە بەڵام چۆن. ؟! بە ئوسلوبێکی جوان بە ئوسلوبێکی رێك، بە ئوسلوبێکی حەکیمانە، بۆ نموونە (ولا نـزك علـى الله احـدا) مـن دوکانی ئیستینساخم هەیە، خەڵك دێ ئستینساخی دەکا وەنیە؟ دەبینی حەلقەکی زێری لەدەستە، یان ئەنگوستیلەیەکی زێری لەدەستە هەر لۆ سوعبەتێ دەڵێم کە ئیشەکەم لۆ کرد دەڵێم: کاکە ئەمڕۆ تەفتیشە، دەستت لەسەر جیهازەکەی دانێ، کابرا پێی عەنتیکەیە دەستی لەسەر جیهازەکەی دادەنێ، دەڵێم: وەللاهی: ئەو ئەنگوستیلەیە زۆر زەرەری هەیە بۆ دونیاتو بۆ قیامەتت لەدەستت بکەوە، دەڵێ: ئێ بەکەسم نەوتووە ئنفیعال بکا بلێ لەدەست ناکەمەوە، بەڵام بە ئوسلوبێکی جوان، ئەگەر پێی بلێم ئەوە چییە ئەو ئەنگوستیلەت لەدەست کردیە، ئی ژنانە عەیب ناکەی.

ئەوجارە ئینفیعالیش دەکا، دەچی قلەکی دیش دەکڕی لە ڕکان لەدەستی دەکا، جا بەڕاستی پێ گوتنی: ئەمر بەچاکەو نەهی لە خراپە عیلمەکە، پێی دەڵێن: (فن الدعوة). (فن الدعوة) ئەوەیە کە ئەتوو بزانی چۆن بەڕاستی ئەو ئیشانەی ئەتوو دەتەوێ لای ببەی یان ئەو ئیشانەی

دایبمەزرێنی،: (شێخ عباس سیسی) هەیە لـە میسر خـوا عـەفوی کـا، وەبزانم نەماوە، لە ئیخوانەکانی قەدیمە کتێبێکی هەیـە بـەناوی (الطریـق الی القلوب) سی‌وسێ فەنی دانایە کە ئـەتوو کـو ئـەمر بەچـاکە دەکـەی نەهی لە خراپە دەکەی، چونکە ئەوە فەنە وەنیە؟ مەسـەڵەن دەڵـێ: ئەگـەر ئەتوو لەناو پاسەکی دانیشتبووی ئێ باشە ئەو پاسە دەڕوا، گریـان لێـرە دەچینە سلێمانی ئێ سەعاتەك بەکرو بێ دەنگی دانیشی کو دەبـی، نـابی ئەمر بەچاکەك نەهی لە خراپەك، دەعـوەکی بکـەم، وەنیـە.؟ دەڵـێ: کـو ئەتوو ئەو کابرایە بەقسە دەینی بەبێ ئەوەی قسەی لەگەڵ بکەی، یەکسەر دەڵێی (سلام علیکم) کـوی باشـی، دەڵـێ: ئـەو کابرایـە چیـە؟! چـەند ناتێگەیشتووە یەکسەر تەداخولی ناو مەوضـوع دەکا، وەنیە؟ نەء. دەڵـێ: وابکە پێیەکی لەپێی بدە، ئەها عەفوەن وەڵڵا نەمزانی کوڕە عـەفووم کـە یەکسەر موجادەڵە دەبتەوە، یان ئەگەر ڕۆژنامەیـەکی پـێ بـوو بڵـێ کـا توخوا لاپەڕەیەکی بدە من ئەمنیش حەزم لێیە خۆم خەریك کەم، دوایـێ مـەوضـوعـەکی لەگـەڵ بکـەوە هـەر لـەناو جەریدەکـەی هێـدی هێـدی ڕایدەکێشی دەست بەقسان دەکەی، دەست بەو ئیـشەی دەکـەی دەتـەوێ، بـەڵام بـەبێ موقـەدیمات بـچیتە نـاو ئیـشی پیـاوێکی ڕەزا قورسـت لێ دەردەچی، بەڕاستی ئینسان دەبی بزانی: فەنی ئەمر بە چاکە کردنو نەهی لە خراپە کردن، جا بۆیا زۆر جاران نەهی لە خراپە خراپەیـەکی گـەورەتری لێ دروست بووە، نابێ خراپەی لێ ئەنجام بدەی، نابێ مەنعیان بکەی، ئیبن



تەیمیە ـ ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ ـ هەندێك تەتەرەکانی دەدیت ئارەقیان دەخواردەوە، دەمبکیان لێدەدا، موسڵمانەکان گوتیان: یا ئیمام بۆ ئەچین ئارەقەکانیان بەسەر سەریان دادەیـن‌و بیشکێنین؟ گوتی: بێ عەقڵینە ئێستا ئەگەر مەنعیان بکەین لە ئارەق خواردن، ئەوە دێن دەمانکوژن، کە ئەوانە شەڕیان لەگەڵ موسڵمانان دەکرد، کوشتنی مە گەورەترە لە ئارەق خواردنێ، هەر لێی گەڕێ با لەو گوناهەی دابن، بەڕاستی ئەوە عەقڵە ، فعلەن ئەگەر ئەتوو بتوانی خراپەیەك لابدەی، ئەو عەقڵەت هەبی خراپەیەکی گەورەتر ئەنجام نەدرێ، دەبێ خراپەکەی ببڕێنیەوە، خراپەیەکت لادا خراپەیەکی گەورەترت لەجێی چاند، ئیشەکی چاکت نەکرد، جا بەڕاستی ئەمر بەچاکەو ئەهی لە خراپە دەبێ ئێمە هەموومان مومارەسەی بکەین، لە خۆماندا ئەوجا بۆ خەڵك، بۆ نموونە لەماڵی خوشکتە براتە باوکتە، چۆن ئەتوانی بڵێیتە باوکت ئەوە غەڵەتە، زۆر زیرەکی‌و دانایی دەوێ ؟ بڵێیتە بابت ئەوە غەڵەتە.

دەڵێ: تۆ چی کوڕە، تۆ هێشتا نازانی خۆت خاوێن کەیتەوە، دێی بە من دەڵێی: ئەوها ئەوها، دەبێ زۆر بە ئەدەب لۆی بچیتە پێش، بڵێ: بابە گوێم لە مامۆستایەکی بوو دەیگوت: پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئاوا دەفەرمووێ: مەڵێ من، خۆت بە بچووك دابنێ، کە فەرموودەکەت لۆ خوێندەوە بەناوی مامۆستایەکیت کرد، باوکت لێت وەردەگری، دایکت لێت وەردەگری، خوشکت، برات لەماڵێ، چۆن تۆ ئەتوانی هەڵسوکەوتی

لەگەڵ بکەی بەجوانترین شێوە کە ئەو نیشانەی ئەو تەسەڕوفاتانەی کە هەیەتی بیگۆڕی، یەکەمین نوقتە لە ئەمر بەچاکەو نەهی لە خراپە دەبی خەڵك خۆشتانی بوێ، دەبێ لەماڵێ خۆشتیان بوێ، نەك لەماڵێ هەموو ڕکیان لێت ببێتەوە، بەقورئان هیچت بەگوێ ناکەن، هەر بڵێی نوێژ حەقە، لە ڕکی توو دەڵێن حەق نییە ، بەڵام ئەگەر خۆشتیان ویست هەموو ئیشەکت بەگوێ دەکەن، ئەوە ئەساسە.. ئەو مەوضوعە ناوێ زۆر دەکێشی، إنشاء الله لۆ وەختەکی تر بی، بەخوای گەورەتان دەسپێرم.. والسلام علیکم ورحمە الله وبرکاتە...

لە شەوی ٢٣/٢٤/١١/٢٠٠٨

نووسینەوەی تەواو بوو ..



## ناوەڕۆك

| لاپەڕە | بابەت |
|---|---|
|  |

هەردەم لە چاوەڕوانی بەرهەمی نوێ داین




نەفس و شەیتان دوو هۆن کە دەتوانین فریوی مرۆڤ بدەن تا لەسەر ئەو سروشتەی کە خوای گەورە مرۆڤی لەسەر دروست کردووە لابدەن و بەو ئاقارەی ببەن کەرووەو دۆزەخ دەبیات، بۆیە دەبێت ئێمە زیـــاتر خۆمان ئامادەبکەین بەزانیاری وەرگرتن لەسەر ئەو دوو هۆیە بۆ ئەوەی بتوانین شەڕیان لەگەڵ بکەین.


بڵاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٢٣٨٦٨
عێراق - کوردستان - هەولێر


نرخی 2000 دینارە


چاپخانەی رۆژهەلات/هەولێر